
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان



# ٣ زانست بۆ هەمووان

## پۆلی سێیەمی بنەڕەتی

## کتێبی قوتابی

چاپی دەیەم
٢٠١٦زایینی / ٢٧١٦کوردی / ١٤٣٧کۆچی

# ناوەڕۆکی کتێبەکە

# یەکەی یەکەم
## زانستە زیندەییەکان

# یەکەی سێیەم

## زانستە فیزیاییەکان

## پرۆژەی یەکەکە

### شلەکان و گەشەی ڕووەك

ڕووەکەکان پێویستیان بە ئاوە بۆ ئەوەی گەشە بکەن و بە ساغی بمێننەوە. لە خوێندنی ئەم بەشەدا دەتوانی تاقیکردنەوە بەجێ بهێنیت، بزانیت کە چۆن شلەکانی دی کار دەکەنە سەر گەشەی ڕووەکەکان، ئەمەش چەند پرسیارێکە بۆ بیرکردنەوە. ئایا ڕووەکەکان گەشە دەکەن ئەگەر لە جیاتی ئاو شلەی دیکەیان بدرێتێ؟ ئایا ڕووەکەکان گەشە دەکەن ئەگەر شلەی دیکە تێکەڵ بە ئاو بکرێت؟ پلانی تاقیکردنەوەیەك دابنێ و جێبەجێی بکە. بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە و پرسیاری تریشت دەست بکەوێت دەربارەی ڕووەك و ئاو کە بەبیرت دادێت.

بەندی



# فرەجۆری زیندەوەران

ڕووەك لە زۆربەی شوێنەكاندا لەسەر زەوی گەشە دەكەن . ڕووەكەكان لە پێوانەدا جیاوازن، هەندێكیان درێژن وەك درەختی بەڕوو و خورما و هەندێكی تریان كورتن وەك گوڵە باخ. هەندێك ڕووەك بە هۆی تۆوەوە زۆر دەبن و هەندێكی تریان بە ڕێگەی تر زۆردەبن. هەروەها هەندێك لە گیانەوەران ئێسك و بڕبڕەی پشتیان هەیە، هەندێكیشیان بەبێ ئێسك و بڕبڕەی پشتن. هەندێك لە گیانەوەران گەڕا دادەنێن و هەندێكیشیان داێ نانێن.

## زاراوەكان

ڕووەكە سادەكان
تۆو
ڕووان
نەمام
نێرەك
مێیەك
مەمكدارەكان
باڵندەكان
وشكاوییەكان
ڕیشووەكان
ماسییەكان
پوولەكە
پەڕەكان
خشۆك
سیرمە

### زانیارییەكی خێرا

ڕووەكی نیسكی ئاو، سەر ئاو دەكەوێت لەو گۆماو و جۆگانەی بە هێواشی دەڕۆن ئەمەش بچووكترین ڕووەكی گوڵدارە لە جیهاندا

**پێودرەكانی ڕووەك**

| ڕووەك | درێژی |
|---|---|
| نیسكی ئاو | ٠,٦ ملم |
| سوبێری ساجوارۆ | ١٥ م |
| حەیزەران | ٣٠ م |
| سوورەدار | ١١٣ م |

بۆق لە نێوان ئیسکی ئاودا

## زانیارییەکی خێرا



### جۆرەکانی گیانەوە لەسەر زەوی




ئایا دەزانی کە لە هەر ١٠٠ جۆرە گیانەوەر لە جیهاندا ٧٥ جۆریان مێرووە.

وانەی ١

# جۆرەکانی ڕووەك چیین؟

لەم وانەیەدا

لێدەکۆڵینەوە لە پێویستییەکانی تۆو بۆئەوەی بڕوێت.

فێری جۆرەکانی ڕووەك دەبێت

زانست دەبەستینەوە بە بیرکاری و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان



## لێدەکۆڵمەوە

# ڕووانی تۆوەکان

**ئامانجی چالاکییەکە** هەریەکە لە خەیار (ئاروو) و گێزەر و سێو ڕووەکن، جیاوازی تەواویان لەگەڵ یەکتردا هەیە لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازیانەدا، هەموویان لە تۆو وە دروست دەبن، تۆویش پێویستی بە شتی دیاری کراو هەیە بۆ ئەوەی بڕوێت و گەشە بکات، لەم چالاکییەدا سەرنجی تۆوە جیاوازەکان دەدەیت بۆ ئەوەی بۆت دەربکەوێت کە پێویستییەکانیان چییە بۆ گەشە کردن تا ببنە ڕووەکی نوێ.

### کەرەستەکان.

- سێ جۆر تۆو
- دەستەسڕی کاغەز
- سێ کیسی نایلۆنی بچووك کە بتوانرێت دابخرێن
- مەقەست
- ئاو
- شریتی لکێنەر
- هاوێنەی دەستی گەورەکردن

## هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. بڕێکی کەم لەتۆوی جۆراوجۆر بەکاربهێنە. پێوانە و شێوە بەکاربهێنە بۆ پۆلێنکردنی تۆوەکان بۆ سێ کۆمەڵە.

٢. دوو دەستەسڕی کاغەز لە ناوەڕاستدا ببڕە. سێ پارچەیان لێ بنووشتێنەوە و لەناو کیسە نایلۆنەکەدا دای بنێ (وێنەی أ) کەمێك لە ئاو بکە سەریان بۆ تەڕ کردنی دەستەسڕەکان.



نەمامی ڕووەکی گەنمەشامی ڕەگ و قەد و گەڵای هەیە.







٣ هەر کۆمەڵێك لەو تۆوانە لەناوکیسێکدا دابنێ و دایبخە کیسەکان بە ١، ٢، ٣، ڕەنووس بکە و کیسەکان بلکێنە بەڕووی ناوەوەی پەنجەرەکەوە.

٤ هاوێنەی دەستی گەورەکردن بەکار بهێنە بۆ سەرنجدانی تۆوەکان ڕۆژانە بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ (وێنەی ب) خشتەیەك بەکار بهێنە وەك ئەوەی لەخوارەوە دیووتە بۆ نووسینی تێبینیەکانت.

| تۆوەکان | ڕۆژ | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| کومەڵەی ١ | | | | | |
| کومەڵەی ٢ | | | | | |
| کومەڵەی ٣ | | | | | |

## دەرئەنجام

١. تێبینی چ گۆڕانێکت لە تۆوەکاندا کرد؟

٢. چۆن خێرایی گۆڕانەکان لەهەر سێ کۆمەڵەکەدا جیاوازن ؟

٣. **چۆن زاناکان کار دەکەن؟** زاناکان سەرنجی لێکۆڵینەوەکانیان بە وردی دەدەن بۆ ئەوەی زانیاری نوێیان دەست بکەوێت، سەرنجدانی تۆوەکان چۆن یارمەتییان دایت بۆ زیاتر تێ گەیشتن لە تۆو ؟

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

کاتێك تێبینی دەکەیت هەستیارەکانی خۆت بەکاردەهێنی بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان. تێبینیکردنی تۆوەکان کە گەشەدەکەن یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی زیاتر لەڕووەك تێبگەیت.



## فێردەبم

# جۆرەکانی ڕووەك

## ئەو ڕووەکانەی کە سپۆر بەرهەم دەهێنن

**ڕووەکە سادەکان** وەك حەزازەکان – گڵەوەز، ڕەگ و قەد و گەڵایان نییە، وە بۆڕیچکەیان نییە بۆ گواستنەوەی ئاو بۆ هەموو بەشەکانی ڕووەکەکە، بەهۆی سپۆرەوە زۆر دەبن.

سەرخەس لەو ڕووەکانەیە کە ڕەگ و قەد و گەڵای هەیە. وەك ڕووەکە سادەکان بەهۆی سپۆرەکان زۆر دەبێت. ئەم سپۆرانەش لەبەشی خوارەوەی گەڵای سەرخەسیدا هەن.

✔ ڕووەکە سادەکان چیین ؟

**بناسە**

- جۆرەکانی ڕووەك
- ڕووەکەکان چۆن زۆر دەبن؟
- پێویستییەکانی تۆو بۆ ڕواندن و گەشەکردن چییە؟

**زاراوەکان**

ڕووەکە سادەکان

تۆو

ڕووان

چەکەرە

نێرەك

مێیەك



ئەمە گڵەوەزی فیوناریایە، بەشەکانی لە ڕەگ و قەد و گەڵا دەچێت. کە یارمەتی ڕووەك دەدەن بۆ دەست کەوتنی پێویستییەکانی ئەم ڕووەکانە وەك ڕووەکانی تر پێویستییان بە ئاو و ڕۆشنایی و خاك و هەوا هەیە بۆ ئەوەی بژین.





ڕووەکە هاوشێوەکانی ئەم سەرخەسە بەهۆی سپۆرەوە زۆر دەبن . لەم وێنە گەورەکراوەدا سپۆرەکان لەناو پێکهاتووی قاوەییدان.

## ئەو ڕووەکانەی کە تۆو بەرهەم دەهێنن



**تۆو** هەنگاوی یەکەمی گەشەکردنە لە زۆربەی ئەو ڕووەکانەی کە ڕەگ و قەد و گەڵایان هەیە. ئەو ڕووەکانەی کە بە تۆو زیاد دەبن، زیاتر لە تۆوێک دروست دەکەن. ئەم تۆیانە سیفەتی پێویست هەڵدەگرن بۆ گەشەکردن تا دەبنە ڕووەکی پێگەیشتوو.

▲گەڵاکانی ڕووەکی کاژ و قوچەکەکانی

دوو کۆمەڵە ڕووەك هەن کە تۆو بەرهەم دەهێنن: ئەوانیش ڕووەکە گوڵدارەکان، کە جۆری جیاواز لە دارە گوڵدارەکان دەگرێتەوە، وە ڕووەکە گوڵدارە بچووکەکان. ڕووەکی قوچەکدار، لەوانەش ڕووکی کاژ.

✔ پێنج ڕووەك بژمێرە کە تۆو دروست دەکەن.

تاڵیشکی چۆلەوانی چەند تۆوێك دروست دەکات کە هەوا بڵاوی دەکاتەوە. ئەم تۆوە لە شوێنی دوور دەڕوێت. ▼



تۆوی سێو و شوتی لەناو بەرەکەدا پارێزراوە. ▼





ئەم کوولەکەیە ئامادەیە بۆ خواردن
بەرەکەی پڕە لەتۆو کەلەوانەیە
بڕوێت بۆ پێکهێنانی ڕووەکی نوێ.

## ڕووانی تۆو

لە چالاکی پێشوودا تێبینی ئەوەت کرد، کاتێك تۆوەکان دەستیان بەگەشە کرد بۆ ئەوەی ببنە ڕووەکێکی نوێ دوایی ئاودان و گەرم بوونییان. کاتێك ڕووەکە بچووکەکە لە تۆوەکە دەردەچێت دەڵێین تۆوەکە دەستی بە **ڕووان** کردووە.

کاتێك تۆوەکە دەست بە ڕوواندن دەکات ڕەگی لێوە گەشە دەکات پاشان بەرگەتۆو دەکرێتەوە و ڕووەکە بچووکەکەی لێوە دەردەچێت کەپێی دەوترێت **چەکەرە** . لە چەکەرە ڕەگ و قەد و گەڵای لێوە گەشە دەکات و درێژ دەبێت. زۆری پێناچێت چەکەرەکە لە خاك دێتە دەرێ گەڵای زیاتر دروست دەکات.

✔ **تۆوەکان بۆ گەشەکردن پێویستیان بەچی هەیە؟**

قۆناغەکانی ڕوواندنی تۆوی کولەکە



چۆن تۆوی کولەکە گەشەدەکات
لەتۆوە بۆ ڕووەکێکی پێگەیشتوو.

## بەشەکانی تۆو

تۆو شێوە و قەبارە و ڕەنگی جیاوازیان هەیە بەڵام هەموو تۆوەکان بەشەکانیان لێك دەچن هەموو تۆوێك بە بەرگە تۆو داپۆشراوە. لە ناوەوەی بەرگە تۆو، چەکەرە و خۆراکی کۆکراوە هەیە.

✔ بەشەکانی تۆو بژمێرە؟

بەشەکانی تۆو

چەکەرە: لەناو هەموو تۆوێکدا هەیە

بەرگەتۆو: پارێزگاری لە هەموو بەشەکانی ناو تۆوەکە دەکات

خۆراکی کۆکراوە: ناوەوەی تۆو زۆربەی خۆراکی کۆکراوەیە کە کۆرپەلە بەکاری دەهێنێت لە کاتی ڕوواندن و گەشەکردندا.

## تیشکێك لەسەر بابەتەکە

### پێوانەی تۆو




درێژی تۆو

تۆوی سێو ٧ ملم

تۆوی گەنمە شامی ١٠ ملم

تۆوی فاسولیا ١٨ ملم

تۆوی ئەفوکادۆ ٣٨ ملم

تۆوی گوێزی هندی ٣٠٠ ملم

٠ ١٠ ٢٠ ٣٠ ٤٠ ٣٠٠

میللیمەتر

## تۆو لەکوێدا پەیدادەبێت؟

تۆو لەناو گوڵدا پەیدادەبێت. سەیری وێنەی ئەو گوڵەی خوارەوە بکە کە بۆ ڕوونکردنەوەیە. بەشی نێرە لەگوڵدا پێ ی دەوترێت **نێرەك** بە بەشی مێیەی گوڵ دەوترێت **مێیەك** تۆوەکان لەبەشی خوارەوەی مێیەکدا پەیدادەبێت لەوکاتەی تۆوەکان پەیدادەبن، بەشی خوارەوەی مێیەك بەدەوری تۆوەکاندا هەڵدەئاوسێت بۆ پێکهێنانی بەر.

هەروەها تۆو لەناو قووچەکدا پەیدادەبێت ئایا لەمەو پێش بەوردی سەیری ڕووەکی کاژت کردووە؟ ئەگەر ئەو سەرنجەت دابێت، ئەوا لەسەر درەختەکان دوو جۆر قووچەکت بینیووە، قووچەکی بچووکی نێرە و قووچەکی گەورەی مێیە. تۆوەکان لەناو قووچەکی مێیەدا پەیدادەبن کاتێك تۆوەکان پێ دەگەن قووچەکەکان دەکرێنەوە و تۆوەکان دەکەونە خوارەوە.




درەختی کاژ ( سنەوبەر ) کە قووچەکی نێرە و قووچەکی مێیەی هەیە.

✔ تۆو لە کوێدا پەیدا دەبێ ؟





▲ ڕووەکی بندق تۆوەکانی بڵاو دەکاتەوە

## پوختە

ڕووەکە سادەکان بەهۆی سپۆرەوە زۆر دەبن، هەندێك ڕووەکی دیکە تۆو بەرهەم دەهێنێت کە بەگەشەکردنی ڕووەکی نوێ پەیدا دەبێت ولێی دەچێت. لەگەڵ ئەوەی تۆوەکان لە شێوەدا لێك جیاوازن و لە یەکتری ناچن بەڵام لە ڕووی پێکهاتنەوە تا ڕادەیەك لە یەك دەچن و پێویستیان بە ئاو و گەرمی گونجاو هەیە تا بڕوێن.

## پێداچوونەوە

**١. چەکەرە چییە ؟**

٢. هەندێك لەو ڕێگایانە چین کە ڕووەکەکان بەهۆیانەوە ڕووەکی دی بەرهەم دێنن ؟

٣. کام ڕووەك تۆو بەرهەم دەهێنێت؟

٤. لەو کاتەی کە دوو تۆ بەیەکتر دەچن، ئایا هەردووکیان گەشە دەکەن بۆ ئەوەی ببنە دوو ڕووەکی وەك یەك؟ ئەمە ڕوون بکەرەوە.

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە:** چی ڕوودەدات کاتێك تۆو دەڕوێت ؟

أ کرانەوەی تۆو و دەرکەوتنی **چەکەرە**.

ب **چەکەرە** لە خاکەوە دەردەچێت.

ج گەڵاکان دەست بە پەیدا بوون دەکەن.

د ڕەگ لە تۆوەوە گەشە دەکات.



## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە بیرکاری

**پرسیارەکە شیکار بکە**

بەکارکردن لەگەڵ قوتابییەکی تر، سێوێك کەرت بکە، تۆوەکانی ناوی بژمێرە. ژمارەی هەموو تۆوەکانی پۆلەکە چەندە؟ تۆوەکان بە شێوەی کۆمەڵ دابنێ، هەر کۆمەڵێك دە تۆو بێت. تێبینی: قوتابییەکان بەشێوەی جووت کاردەکەن، هەردوو قوتابی لە پۆلدا سێوێك کەرت دەکەن.



### لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە

**تۆو خۆراکە**

لەجۆری ئەو تۆوانە بکۆڵەوە کە مرۆڤ وەك خۆراك بەکاریدێنێت لەوەی فێربوویت بەشداری بە قوتابییانی پۆلەکەت بکە.

## وانەی ٢

# مەمکدار و باڵندەکان چیین؟

لەم وانەیەدا

لێدەکۆڵینەوە
چۆن فەروو یارمەتی گیانەوەر دەدات

فێری
جیاکەرەوەی مەمکدارەکان و باڵندەکان دەبیت

زانست دەبەستێت بە بیرکاری و هونەرجوانەکان





لێدەکۆڵمەوە

# فەروو یارمەتی گیانەوەران دەدات

**ئامانجی چالاکییەکە** کاتێك دەوروبەر سارد دەبێت، چاکەتی خوری لەبەر دەکەی بۆ ئەوەی گەرم ببیتەوە. گیانەوەران ناتوانن ئەوە بکەن لەم چالاکییەدا نموونە بەکار دەهێنین بۆ ئەوەی بزانین کەچۆن فەروو بۆ خۆ گەرم کردنەوە بەکار دەهێنرێت.

### کەرەستەکان

- کەتیرە «جەوی»
- دوو قووتوی کانزایی
- ناواخنی لۆکەیی
- ئاوی گەرم
- دوو گەرمی پێو
- کاتژمێر

وورپایە ٨

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ وێنەی خشتەیەك بکێشە هەروەك ئەوەی لەلاپەڕەی بەرامبەردایە.

٢ کەتیرە (جەوی) بڵاوبکەرەوە بەسەر یەکێك لە قووتوەکاندا پاشان چینێکی ئەستوور لۆکە (پەموو) بنووسێنە بەسەریدا بۆ ئەوەی دایبپۆشی چاوەڕوان بە، تا کەتیرەکە وشك دەبێتەوە لۆکەکە بە پەنجەت بەسەر قووتوەکەدا بڵاوبکەرەوە (وێنەی أ).

ئەو فەرووەی کەلەشی ئەم کەڵەکێویەی ((شور)) داپۆشیوە بە درێژایی زستان گەرمی دەکاتەوە



وێنەی ا



وێنەی ب

٣ وریابە وریای ئاوی گەرم بە لەوانەیە بتسووتێنێت مامۆستا دوو قوتووەکە پڕ لە ئاوی گەرم دەکات.

٤ گەرمیپێو لە ناو هەردوو قوتووەکەدا دابنێ و پلەی گەرمی ئاوەکە **تۆماربکە** (وێنەی ب)

٥ سەرنجی پلەی گەرمی ئاوی ناو هەردوو قوتووەکە بدە هەر ١٠ خولەك جارێك، بۆ ماوەی ٣٠ خولەك **تۆماربکە**.

| کات | پلەی گەرمی ئاو لە قوتووە بە لۆکە داپۆشراوەکە | پلەی گەرمی ئاوی ناو قوتووە بە لۆکە دانەپۆشراوەکە |
|---|---|---|
| سەرەتا | | |
| دوای ١٠ خولەك | | |
| دوای ٢٠ خولەك | | |
| دوای ٣٠ خولەك | | |

## دەرئەنجام

١. لە کام قوتووێك دا ئاوەکە بۆ ماوەیەکی زیاتر بەگەرمی دەمێنێتەوە ؟ بۆچی؟

٢. چۆن فەرووی گیانەوەران لەو پاڵتۆیە دەچێت کە مرۆڤ لەبەری دەکات؟

٣. چۆن زاناکان کاردەکەن. زاناکان، بەشێوەیەکی گشتی **نموونەیەك بەکار دەهێنن** بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو شتانەی کە ناتوانن بە ئاسانی بیانبینن. لەم چالاکییەدا نموونەی گیانەوەرێکی فەروو پۆش دروست کراوە. چی وا دەکات کە بەکارهێنانی نموونەکە بۆ بینین ئاسانتر بێت لە بینینی گیانەوەرەکە خۆی؟

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

ناتوانرێت بەئاسانی پلەی گەرمی گیانەوەرێکی ڕاستەقینە بپێوی بۆ ئەوەی بزانین تا چەند فەروو پلەی گەرمی گیانەوەرەکە دەهێڵێتەوە. بەکارهێنانی نموونە یارمەتیمان دەدات بۆ فێربوون دەربارەی فەرووی گیانەوەران.



فێردەبم

# مەمکدارەکان و باڵندەکان

بناسە
- چوار جیاکەرەوەی مەمکدارەکان
- پێنج جیاکەرەوەی باڵندەکان

زاراوەکان

مەمکدارەکان

باڵندەکان

## مەمکدارەکان

لە چالاکییەکەی پێشوودا فێر بوویت کە چۆن فەروو یارمەتی گیانەوەر دەدات بۆ ئەوەی بە گەرمی بمێننەوە، گیانەوەرە بە فەروو یان بە موو داپۆشراوەکان پێیان دەڵێن **مەمکدارەکان** . ئەسپ و مانگاو ئاسك و بزن لە مەمکدارەکانن.

مەمکدارەکان بەسییەکانیان هەناسە دەدەن. تەنانەت ئەو مەمکدارانەش کە لە ئاودا دەژین وەك نەهەنگ بەسییەکانیان هەناسە دەدەن. بۆیە پێویستە ئەو مەمکدارانە سەر ئاو بکەون بۆ وەرگرتنی هەوای پێویست بۆ هەناسەدان.

زۆربەی مەمکدارەکان بێچوویان دەبێت. پشیلەی مێ سکی پڕ دەبێت تا ماوەیەك دەمینێتەوە پێش ئەوەی بێچووەکان لە دایك ببن.

## تیشکێك لەسەر بابەتەکە

### بۆ ئەوەی گەرم بمێنێتەوە

فەرووی ورچی جەمسەرەکانی زەوی بەسپی دەردەکەوێ، بەڵام لە ڕاستیدا روونە و سپی دەردەکەوێت چونکە تیشکی خۆر دەداتەوە.




پێستی ژێر فەرووی ورچی جەمسەرەکان کە ڕەنگی ڕەشە، گەرمی خۆر دەمژێت. چینێکی ئەستوور لە چەوری لە ژێر پێستەکەیدایە یارمەتییان دەدات کە بە گەرمی بمێنێتەوە.



بێچووە پشیلەکان دوای لە دایك بوونیان ئەو شیرە دەخۆن کە لە لەشی دایکیاندا بەرهەم دێت. خواردنی شیر لەلایەن بێچووەکانەوە جیاکەرەوەیەکی تری مەمکدارەکانە، بێچووی مەمکدارەکان دوای لەدایك بوونیان ناتوانن چاودێریی خۆیان بکەن. دایکیان شیریان دەداتێ و پەناگەی پێویستییان بۆ دابین دەکات. شیری دایك یارمەتییان دەدات کە گەشە بکەن و تەندروست بن.

بێچووی زۆربەی مەمکدارەکان لە باوانیانەوە (دایك وباوك) فێردەبن کە چۆن بایەخ بەخۆیان بدەن. بەزۆری باوان بێچووەکانیان فێردەکەن کە چۆن خۆراکیان دەست بکەوێت بە تێپەڕبوونی کات بێچووی مەمکدارەکان فێردەبن کە چۆن پێویستییەکانیان بۆ خۆیان دابین بکەن.



▲ تووتکە سەگەکان (بێچووەکان) شیری دایکیان دەخۆن بۆ ئەوەی خۆراکی پێویستیان بەدەست بکەوێت.

✔ **ئەو چوار جیاکەرەوەیە چییە کە بێچووی مەمکدارەکان لە باوانیانەوە وەریدەگرن؟**

گیانەوەری گۆریلا بەشێوەی خێزانی گەورە بەیەکەوە دەژین. هەموو پێگەیشتووەکان یارمەتی بچووکەکان دەدەن. ▼

## جۆرەکانی مەمکدار

مەمکدارەکان چەند جۆرێکن، زۆربەی مەمکدارەکان ئەو چوار جیاکەرەوەیان هەیە کە لەوەوپێش دیاری کراوە.
بەڵام هەندێك لە مەمکدارەکان ڕەوشی تریان هەیە وەك هەبوونی لمووز و تورەکە و باڵ، مەمکدارەکان بەزۆری بەشێوەی کۆمەڵ دادەنرێن بە پێی ڕەوشە هاوبەشەکانیان هەندێك لەو کۆمەڵانەو جیاکارەکانیان لەم لاپەڕەیەدا دەردەکەون.



▲ شەمشەمەکوێرە تاکە شیردەرە کە دەفڕێت.

✔ سێ جیاکەرەوە بژمێرە کە بۆ دانانی مەمکدارەکان لە کۆمەڵەکاندا بەکاردێت.



▲ ژوژکە مێرووله خۆر مێرووله دەخوات. بێچووی نابێت بەڵکو هێلکە دادەنێت.

مەیمونی نۆرانغوتان و جۆری دیکەی مەیمونەکان. دەستیان بۆ شتگرتن بەکاردەهێنن. ▼



گیانەوەری کوالا یەکێکە لە مەمکدارەکان کە بێچووەکانیان لەناو تورەکەدا هەڵدەگرن. ▼





نەهەنگەکان مەمکدارن لە ئاو دا دەژین. ئەم گیانەوەرانە زۆرکەم موویان هەیە کە یارمەتی هەڵخلیسکانیان دەدات لە ئاو دا. ◄

## باڵندەکان

**باڵندەکان** ئەوگیانەوەرانەن کە لەشیان بە پەڕ داپۆشراوە، دوو قاچ و دوو باڵیان هەیە. زۆربەی باڵندەکان باڵەکانیان بۆ فڕین بەکار دەهێنن، هەندێك لە باڵندەکان وەك پەنگوین «بەتریق» ناتوانن بفڕن.

باڵندەکان جوتێك سییان هەیە بۆ هەناسەدان هەروەك مەمکدارەکان. بەپێچەوانەی بێچووکانی زۆربەی مەمکدارەکان، بێچووی باڵندەکان لەهێلکە دەتروکێن.

هەندێك پەڕ وەك ئەوەی لەشی داپۆشیوە یارمەتی پاراستنی پلەی گەرمی لەشیان دەدەن و ئەوپەڕانەی کە لەسەر باڵەکانیانن بەجۆرێك گونجاون یارمەتی فڕینیان دەدەن.

✔ پێنج جیاکەرەوەی باڵندە بژمێرە؟



▲ باڵندەی هێلانەچن گەڵای رووەکەکان بەکاردەهێنێ لە دروست کردنی هێلانەیەکی هەڵواسراو. مێیەکان هێلکەکانیان ناو هێلانەکەدا دادەنێن.



## جۆرەکانی باڵندە

باڵندەکان پۆلێن دەکرێن بەپێ ی تایبەت مەندی هاوبەشەکانیان، گرنگترینیان شێوەی قاچەکان و شێوەی دەنوکەکەیانە. شێوەی دەنوکەکەیان جۆری ئەو خواردنە دیاری دەکات کە باڵندەکە دەیخوات هەندێ لە باڵندەکان دەنووکی درێژیان هەیە، کە یارمەتیان دەدات بۆ گرتنی ماسی و دەرهێنانی گیانەوەرانی ناو قوڕ.

شێوەی قاچی باڵندە بەکاردەهێنرێ بۆ دیاریکردنی شوێنی ژیانی باڵندە، باڵندەی خۆ نقومکەر پەنجەی قاچەکانیان درێژە، یارمەتی باڵندەکە دەدات بۆ ئەوەی لە قووڕدا نقوم نەبێت، لەهەندێ باڵندەدا شێوەی قاچەکانیان گرنگە بۆ بەدەستکەوتنی خۆراك.

✔ دەتوانیت چی فێربیت لە شێوەی دەنووك و قاچی باڵندە؟



▲ قاچەکانی باز گونجاون بۆ گرتنی ئەو گیانەوەرانەی ڕاویان دەکات.



کەو دەنوکەکەی بۆ دانەوێڵە خواردن بەکاردێنێ ◄

مریشکی ناوی لە زۆنگاوەکاندا دەژی پەنجەکانی درێژ و باریکە کە یارمەتی دەدات بەسەر گەڵای زەنبەق و ڕووەکە ناوییە سەر ئاو کەوتووەکاندا بڕوات. ▼



شینە شاهۆ باڵندەیەکی خۆنقومکەرە شێوەی دەنووکی یارمەتی دەدات بۆ ماسی گرتن ◄



## پوختە

مەمکدارەکان ئەو گیانەوەرانەن کە لەشیان بەفەروو یان بەموو داپۆشراوە و بەسییەکانیان هەناسە دەدەن زۆربەی مەمکدارەکان بێچوویان دەبێت، بە شیر بەخێویان دەکەن کە لە لەشی دایکەکانیان بەرهەم دێت. باڵندەکان لەشیان بەپەڕ داپۆشراوە جووتێك باڵ و جووتێك قاچییان هەیە هەروەك مەمکدارەکان بە سییەکان هەناسە دەدەن. بەپێچەوانەی مەمکدارەکان، باڵندەکان هێلکە دەکەن کە دەتروکێت بێچووەکانیان لێ دێتە دەرێ.

## پێداچوونەوە

١. ناوی گیانەوەرێکی مەمکداری ئاوی بڵێ چۆن هەناسە دەدات؟

٢. ژوژکی مێروولە خۆری دڕکاوی بەچی لە شیردەرەکانی تر جیادەکرێتەوە؟

٣. ئەو دوو جیاکەرەوە گرنگە چین کە بۆ پۆلێنکردنی باڵندە بەکاردەهێنرێ؟ بۆچی؟

٤. شەمشەمە کوێرە گیانەوەرێکە توانای فرینی هەیە هەرچەندە لە مەمکدارەکانە. ئەو سیفەتانە چین کە وا دەکات شەمشەمەکوێرە شیردەربێ نەك باڵندە؟

٥. **ئامادەکاریی بۆ تاقیکردنەوە** ئەو جیاکەرەوانە کامانەن کە هاوبەشن لە نێوان باڵندە و مەمکدارەکان؟

أ بە پەڕ داپۆشراون.

ب بە فەروو داپۆشراون.

ج بە سییەکانیان هەناسە دەدەن.

د بێچووەکانیان لە دایك دەبێت.



## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە بیرکارییەوە

**وێنەی ڕوونکەرەوەکان لێك بدەرەوە**

سەرنجی وێنەی داتایی لاپەڕە ٢٥ بدە کام لە باڵندەکان درێژترین کلکی هەیە؟ کام لە باڵندەکان درێژتر دەبێت ئەگەر درێژی کلك بخرێتە سەر درێژیی لەشی لە وێنەکەدا؟



### بەستنەوە بە هونەرەجوانەکان

**جێ پێی گیانەوەران**

زۆر لە گیانەوەران لەیەکتری جیا دەکرێنەوە بە جێ پێیەکانیان. هەڵواسراوێك دروستبکە کە شوێنگری جێپێی گیانەوەری جۆراوجۆری تێدا هەبێت. ناوی هەر گیانەوەرێك لە شوێنی جێ پێیەکەی بنووسە کە جێی دەهێڵێت.

وانەی ٣

# وشکاوەکی و ماسی و خشۆکەکان چیین؟

لەم وانەیەدا

لێدەکۆڵینەوە
چۆن بۆق دەگۆڕێت لەکاتی گەشەکردندا.

فێری
وشکاوەکی و ماسی و خشۆکەکان دەبێت.

زانست دەبەستینەوە
بەبیرکاری و نووسیندا.



## لێدەکۆڵمەوە

# لە هێلکەوە بۆ بۆق

**ئامانجی چالاکییەکە** بۆق هێلکەکانیان لە ئاودا دادەنێن سەرەمێکوتەکان کە لە هێلکەکان دەتروکێن، لە ئاودا نەبێت ناتوانن بژین لەو کاتەی کە سەرە مێکوتەکان گەشە دەکەن لەشیان دەگۆڕێت. ئەو گۆڕینە توانای ژیانی دەداتێ لە وشکانیدا. لەم چالاکییەدا، سەرنجی ئەو گۆڕانکارییانە دەدەیت کە لە بۆقی ڕاستەقینەدا ڕوودەدات.

### کەرەستەکان

- چەو
- حەوزی ماسی
- ئاو
- ڕاستە
- ڕووەکە ئاوییەکان
- تاوێر
- کۆمەڵێك لە سەرە مێکوتە
- خۆراکی ماسی وشککراوە



ئەو هێلکانەی بۆق لە ئاودا دانراون دەتروکێن و سەرە مێکوتەیان لێ پەیدا دەبێت.



بە پێچەوانەی ئەو بۆقانەی کە دەیناسی، ئەم بۆقە چاو سوورە لە سەر درەخت دەژی



وێنەی أ

## هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ چینێك چەو لە بنی حەوزەکەدا دابنێ پاشان ١٢ – ١٥ سەنتیمەتر ئاوی تێبکە.

٢ هەندێك ڕووەکی ئاوی دابنێ بۆ ئەوەی سەر ئاو بکەون، هەندێکی تریان لە چینە چەوەکەدا بچەقێنە پاشان بەردێك لە سەر چینە چەوەکە دابنێ باش وایە بەردەکە گەورەبێت بەشێوەیەك کە دواتر بۆقەکە بتوانێت لە سەری دابنیشێ و لەشی بۆقەکە لەسەر ڕووی ئاوەکەوە بێت (وێنەی أ)

٣ دوو سەرەمێکوتە بخە ناو ئاوەکە ، حەوزەکە وا دابنێ کە ڕووناکی لێ بدات ، بەڵام ڕاستەوخۆ تیشکی خۆری لێی نەدات.

٤ خۆراکی ماسی وشککراو بدە بە سەرە مێکوتەکان، ڕۆژی یەك جار. هەفتەی جارێك برێك ئاوی سازگار بکەرە ناو حەوزەکەوە.

٥ ڕۆژانە سەرنجی سەرەمێکوتەکان بدەو وێنەیان بکێشە هەر هەفتەی جارێك وەك ئەوەی دەردەکەون.

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

کاتێك سەرنج دەدەیت، هەستیارەکانی بینین و بیستن و بۆنکردن و بەرکەوتن بەکار دێنیت پاشان تۆماریان دەکەیت یان تێبینییەکانت دەنووسی.

## دەرئەنجام

١. ئەو گۆڕانانە چی بوون کە تێبینیت کرد لەکاتی گەشەی سەرەمێکوتەکاندا؟

**٢. کاتێک سەرە مێکوتەکان لە ئاوەکە دەردەچن، بە چ شێوەیەک دەردەکەون؟**

٣. **چۆن زاناکان کاردەکەن** زاناکان تێبینییەکانیان تۆماردەکەن چۆن تۆمارکردنی تێبینییەکانت یارمەتی فێربوونت دەدات دەربارەی گەشەی سەرە مێکوتەکانی بۆق؟



فێردەبم

# وشکاوەکییەکان و ماسییەکان و خشۆکەکان

**بناسە**
- چوار جیاکەرەوە وشکاوەکی
- پێنج جیاکەرەوەی ماسی
- سێ جیاکەرەوەی خشۆك

**زاراوەکان**
وشکاوەکییەکان
ڕیشوەکان
ماسییەکان
پوولەکە
پەڕەکە
خشۆکەکان
سیرمە

## وشکاوەکییەکان

بۆق لە وشکاوەکییەکانە. **وشکاوەکییەکان** ئەو گیانەوەرانەن، ژیانیان لەئاوەوە دەست پێ دەکات و پاشان دوای پێگەیشتنیان دەچنە وشکانییەوە، وشکاوەکی هێلکەکانی لە ئاودا دادەنێت ئەو هێلکانە لە ئاودا دەمێننەوە تاکو دەترووکێن. وشکاوەکی تازەپێگەیشتوو لە ئاودا دەژی هەر وەکو سەرە مێکوتە. بەڵام زۆربەی وشکاوەکییە پێگەیشتووەکان لە وشکانیدا دەژین.

وشکاوەکییەکان پێستێکی شێداریان هەیە زۆربەیان لە نزیك ئاوەوە دەژین.

✔ سێ جیاکەرەوەی گیانەوەری وشکاوەکی بژمێرە؟



ئەو بۆقە پێستێکی زبری هەیە چونکە زۆربەی کاتی ژیانی لە وشکانیدا بەسەر دەبات، بە پێچەوانەی وشکاوەکییەکانی دیکەوە. ◄



خاچخاچۆك (سەلیمەندەر) لەشی دەجوڵێنێ بەم لاو بەولادا بۆ ئەوەی پێیەکانی یارمەتی جووڵەی بدات بەرەو پێشەوە. ▼



خاچخاچۆك (سەلیمەندەر)ی ئاوی بۆ ماوەی بەشێك لە ساڵێکدا لەناودا دەژی پاشان لەناو دەردەچێت بۆ ئەوەی لەوشکانیدا بژی. ▼




### شێوە گۆڕانی بۆق

شێوەی بۆق دەگۆڕێت لە کاتی گەشەکردنیدا لە هێلکەوە تا دەگاتە بۆقێکی پێگەیشتوو گۆڕانی شێوەی بۆق پێی دەووترێ شێوە گۆڕان.

١ مێیەی بۆق ژمارەیەکی زۆر هێلکە لەیەککاتدا دادەنێ. هێلکەکان بە چینێکی شێوە جەلاتین دادەپۆشێ.

٢ سەرەمێکوتە ڕیشووەی هەیە بۆ هەناسە دان لە ئاودا، کلکی هەیە، بەڵام قاچی نییە.

٣ لەوکاتەی سەرەمێکوتە گەشەدەکات، سییەکانی دەست بە دروستبوون دەکەن. هەروەها هەردوو پەلی دواوە و هەردوو پەلی پێشەوە دەست بە گەشە دەکەن. پەلەکان، ژیانی سەر وشکانی بۆ بۆقی پێگەیشتوو دەرەخسێنن.

٤ ریشووەکان و کلك دەپووکێتەوە لەو کاتەی سییەکان دەست بە کار دەبن. بەو شێوەیە بۆق دەتوانی لە وشکانیدا بژی.

## بۆق گەشەدەکات و دەگۆڕێت

لە چالاکی پێشوودا سەرنجی، ئەوەت دا کە بۆقێکی پێنەگەیشتوو بەتەواوەتی جیاوازە لە بۆقێکی تەواو پێگەیشتوو. سەرەمێکوتە لە هێلکە دەردەچێت و ژیانی لە ئاودا دەست پێ دەکات کە هەناسە دەدات بەهۆی **ڕیشووەکانییەوە**. ڕیشووەکان ئەو بەشانەن لە لەشدا ئۆکسجینی تواوەی ناو ئاوی پێ وەردەگرێت.

سەرە مێکوتەکان لەکاتی گەشەیاندا دەگۆڕێن بەتێپەڕبوونی کات، سییەکانیان بۆ پەیدادەبێت لەو کاتەی کە سییەکان دەردەکەون ڕیشووەکان بەرەو پووکانەوە دەچن قاچەکانیان گەورە دەبێت و کلکیان دەپووکێتەوەو، دەبنە بۆقێکی پێگەیشتوو کە دەتوانن لە وشکانیدا بژین. پاشان بۆقە پێگەیشتووەکان بەشی زۆری ژیانیان لەسەر وشکانی دەبێت نزیك بە ئاو.

✔ کام بەش لەلەشی سەرەمێکوتەدا هەیە و لە بۆقی پێگەیشتوودا نییە؟

## ماسییەکان

**ماسییەکان** ئەو گیانەوەرانەن کە هەموو ژیانیان لە ئاودا بەسەر دەبەن. ماسییەکان ریشوویان هەیە. ریشووەکان دەکەوێتە ئەم لاو ئەولای سەرە، کە ئۆکسجینی تواوە لە ئاو وەردەگرن. لەشی ماسی بە پولەکە داپۆشراوە.

**پولەکە** پەڕەی بچووکی تەنك و ڕووتەختن. لەشی ماسی دەپارێزن. وە یارمەتی ماسییەکان دەدەن لە هەڵخلیسکاندنیان لە ناو ئاودا.

ماسی پەڕەکەی هەیە. **پەڕەکە** ئەو بەشەی لەشی ماسییەکە یارمەتی جووڵەی دەدات لە ئاودا بە هەموو لایەکدا. زۆربەی ماسییەکان هێلکە دادەنێن.

✔ سێ جیاکەرەوەی ماسییەکان بژمێرە



▲ ماسی جەنەم پەیکەرێکی ئێسکیان هەیە لە نزیك کەناری کەنداوی عەرەبی لە ئاوە دوورەکان دەژێت.



ماسی لەخمە پەیکەرێکی کرکراگەیان هەیە هەروەکو ماسی قرشە، بەڵام لەشیان تەختە ◄

ماسی قرش پەیکەرە ئێسکییان نیە لەجیاتی ئەوە، پەیکەری نەرمی کرکراگەییان هەیە.▼



## خشۆكەكان

**خشۆك** گیانەوەرێكی وشكانیە و پێستێكی وشكی هەیە كە بەسیرمە داپۆشراوە.

**سیرمە** پەڕەی ڕەقن، لەشی خشۆكەكان دەپارێزێن. لەبەر ئەوەی خشۆكەكان بەزۆری لەسەر وشكانی دەژین، سییەكانیان بۆ هەناسەدان بەكار دەهێنن.بەڵام ئەو خشۆكانەی زۆربەی كاتەكانیان لە ئاودا بەسەر دەبەن بەرەو ڕووی ئاوەكە دێن بۆ هەناسە وەرگرتن هەروەك تیمساح لووت و چاوەكانیان لەسەر ڕووی ئاوەوە دەهێڵنەوە بۆ ئەوەی هەناسە بدەن و ببینن. زۆربەی خشۆكەكان مێیەكانیان هێلكەكانیان لە وشكانیدا دادەنێن.



▲ كیسەڵی دەریایی لەو هێلكانەوە دەترووكێن كە مێیەكان لە وشكانیدا دایدەنێن.

✔ سێ جیاكەرەوەی خشۆكەكان بژمێرە؟

كیسەڵ قەلغانێكی پتەوی هەیە زۆربەی لەشی دەپارێزێت. كیسەڵ لەشی بە سیرمە داپۆشراوە. ▼

## جۆرەکانی خشۆك

سێ کۆمەڵەی سەرەکی لە خشۆکەکان هەیە هەریەکە لەمارمێلکە و مار سەر بە کۆمەڵەی یەکەمن. لەشی مارمێلکە و مار بە سیرمە داپۆشراوە. مارمێلکە چوار پەل و کلکێکی درێژی هەیە بەڵام مار قاچی نییە.

کۆمەڵەی دووەم لە خشۆکەکان تیمساحە کە لە ئاودا دەژی بۆماوەیەکی درێژ، بەڵام ناو بەناو دەردەچێت بۆ خۆدانە بەر تیشکی خۆر.

کیسەڵ کۆمەڵەی سێیەمی خشۆکەکانە کە لەشیان بە قەڵغانێك داپۆشراوە وە دوو جۆرن. جۆرێك لە وشکانیدا دەژین و وە ئەوی تریان لەناو دەریادا دەژین.

✔ هەرسێ کۆمەڵەکەی خشۆك چین؟



▲ ماری کۆبرای ڕەشی میسری جۆرێکە لە مار. هەروەك مارەکانی تر کۆبرای ڕەش توێکلی پێستی فڕێ دەدات بۆ ئەوەی پێستێکی نوێ گەشە بکات.



مارمێلکەی کەشکەشی نوستورالی

▲ هەندێك بەشی لەشی وەك پەڕەی پانکە بۆ ترساندنی دوژمنەکانی بەکار دەهێنێت

تیمساح دەتوانێت بە کپی لە ئاودا خۆی نقوم بکات تەنها چاوەکانی و لوتی لە دەرەوە دەبێت. یارمەتی دەدات بۆ ڕاوکردنی گیانەوەرانی دیکە بۆ ئەوەی نەیبینن. ▼





▲ کیسەڵی وشکانی هەروەك کیسەڵی دەریا وایە لەشیان بە قەڵغانێکی ڕەق داپۆشراوە بۆ پاراستنیان لە دوژمن

## پوختە

وشکاوەکییەکان، ئەو گیانەوەرانەن کە سەرەتای ژیانیان لە ئاوەوە دەست پێ دەکات. شێوەکانیان دەگۆڕێت پاشان دەگوێزرێنەوە بۆ سەر وشکانی. ماسی لە ئاودا دەژی بەهۆی ڕیشووەکانیەوە هەناسە دەدات. خشۆك گیانەوەرێکن لەشیان بە سیرمە داپۆشراوە.

## پێداچوونەوە

١. چی ڕوودەدات لەکاتی شێوە گۆڕانی بۆقدا؟

٢. سێ جیاکەرەوەی ماسییەکان بڵێ کە یارمەتی ژیان و جووڵەیان لە ئاودا دەدات؟

٣. ڕۆڵی ڕیشووەکان چییە؟

٤. لەبەرچی وشکاوەکییەکان بە درێژایی ژیانییان لە نزیك ئاو دەژین؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** ئەو جیاکەرەوەی زۆربەی زیندەوەرانی ماسی و وشکاوەکی و خشۆکی تیا هاوبەشن بریتییە لە.

أ ڕیشووەکان — ج هێلکە

ب پولەکە — د پەلەکان



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### وێنەیەکی داتایی جێ بەجێ بکە.

ئاماری هەندێك جۆرە ماسی بکە کە خەڵك لە ماڵاندا بەخێویان دەکەن، وێنەیەکی داتایی بەشێوەی ستوونی بکێشە بۆ دیاری کردنی باسەکەت.



بەستنەوە بە نووسین

### چیرۆکێك

بۆ ئەوانەی لەخۆت بچووکترن بنووسە تیایدا دیاریکە چۆن بۆق لە هێلکەوە دەبێتە بۆقێکی پێگەیشتوو.

# بەندی ١ پێداچوونەوەو ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

ئەم زاراوانەی خوارەوە بەکاربێنە بۆ تەواوکردنی ڕستەکان لە (١ تا ١٥) ژمارەی لاپەڕەکەی تۆمارکراو لە نێوان ( ) شوێنی بوونی زانیارییەکان لە بەندەکەدا نیشان دەدات کە لەوانەیە پێویستیت پێیان هەبێت.

| | |
|---|---|
| ڕووەکی سادە (١٤) | وشکاوەکییەکان (٣٠) |
| تۆو (١٥) | ڕیشووەکان (٣١) |
| ڕووان (١٦) | ماسییەکان (٣٢) |
| چەکەرە (١٦) | پولەکە (٣٢) |
| نێرەك (١٨) | پەرەکە (٣٢) |
| مێ یەك (١٨) | خشۆکەکان (٣٣) |
| مەمکدارەکان (٢٢) | سیرمە (٣٣) |
| باڵندەکان (٢٥) | |

١. یەکێك لەسیفەتەکانی ـــــ ئەوەیەکە لەشییان بە فەروو داپۆشراوە.

٢. ئەو گیانەوەرانەی کە ژیانیان لە ئاوەوە دەستپێدەکات پاشان دەچنە وشکانییەوە ناودەبرێت بە ـــــ .

٣. زۆربەی ڕووەکەکان لە ـــــ گەشە دەکەن.

٤. ـــــ ئەوانەن کە لەشیان بە پەڕ داپۆشراوە.

٥. ـــــ لەشی ماسی دادەپۆشێت.

٦. پوولەکە هاوکاری ـــــ دەکات بۆ هەڵخلیسکانیان لە ئاودا.

٧. ـــــ بێچووی وشکاوەکییەکان و ماسییەکان بۆ هەناسەدان بەکاری دەهێنن.

٨. تۆ پێویستی بە ئاو هەیە بۆ ئەوەی ـــــ .

٩. ـــــ لە شیان داپۆشراوە بە پێستێکی وشکی سیرمەیی.

١٠. ئەو ڕووەکە بچووکەی کە لە تۆ دەردەچێت بریتییە لە ـــــ .

١١. ئەو ڕووەکانەی کە قەد و ڕەگ و گەڵایان نییە بریتییە لە ـــــ .

١٢. ـــــ ئەو بەشانەن کە یارمەتی جووڵەی ماسی دەدەن.

١٣. گوڵەکان تۆدروست دەکەن لە بەشی خوارەوەی ـــــ .

١٤. ـــــ لەشی خشۆکەکان دادەپۆشی و دەیانپارێزێت.

١٥. نێرە ئەندامی گوڵە بریتییە لە ـــــ .

## بەستنەوەی چەمکەکان

ئەم بۆشاییانە لە نەخشەی چەمکەکانی خوارەوە بە وشەو ڕستەی گونجاو پڕبکە.



## دڵنیا بوون لە تێگەییشتن

پیتی گونجاو لەمانەی خوارەوە بخەرە ناو بازنە.



١. سەیری وێنەکە بکە. بۆ کام بەش لەتۆوەکە، تیرئاساکە ڕاکێشراوە؟

أ خۆراکی کۆکراوە. ج بەرگە تۆو

ب چەکەرە «کۆرپەلە» د قەد

٢. ڕووەکە ساددەکان ________ یان هەیە.

أ گوڵ ج قووچەك

ب سپۆر د تۆو

٣. کام کۆمەڵە گیانەوەر ، بێچووەکانیان بەشیر بەخێو دەکەن ؟

أ ماسی ج مەمکدار

ب وشکاوەکی د باڵندە

٤. کام کۆمەڵەی گیانەوەر پێستیان شێدارە؟

أ باڵندە ج ماسی

ب خشۆك د وشکاوەکی

٥. خاچخاجۆك (سەلەمەندەر) سەر بەکام کۆمەڵە گیانەوەرە ؟

أ خشۆك ج ماسی

ب مەمکدار د وشکاوەکی

٦. کام لەوانەی خوارەوە سیفەتی مەمکدارەکانە؟

أ هێلکە دادەنێت

ب بەریشووە هەناسە دەدەن

ج بێچوویان دەبێت

د پێستیان بە پوولەکەی وشك داپۆشراوە.

**وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەرەوە**

٧. چۆن هەناسەدان لە ماسی جیاوازە لە هەناسەدانی خشۆکەکان.

٨. لەبەرچی تیمساح دەمرێت. ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك نەیتوانی لە ژێر ئاوە بێتە سەر ئاوەوە؟

## پێداچوونەوەی کارامەییە کردەییەکانی زانست

١. ئەم گیانەوەرانەی خوارەوە بە شێوەی کۆمەڵ **پۆلێن بکە** ؟ مار - باڵندەی باڵ شەکیلە - سەگ -مارمێلکە - مانگا - قاز - نەهەنگ. پاشان هۆی ئەو جۆرە پۆلێن کردنە ڕوونبکەوە؟

٢. تۆ گرنگی بە دوو ڕووەك دەدەیت و دەتەوێ یەکێکیان تاقیبکەیتەوە تا بزانی چۆن تیشکی خۆر کار لە گەشەی دەکات. هەموو پێداویستییەکان بۆ ڕووەکەکەی تر دابین بکە، نەخشەی تاقیکردنەوەیەك ئامادە بکە، ڕوونی بکەوە چۆن تێبینی هەردوو ڕووەکە دەکەی و ئەنجامەکانت بەراورد دەکەیت.

٣. چۆن دەتوانی هەستەکانت بەکاربهێنی بۆ **سەرنجدانی** باڵندەکان؟

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

**پۆلێن کردنی گیانەوەران**

کارتی گیانەوەران بەکاربهێنە. گیانەوەران پۆلێن بکە بە پشت بەستن بەوەی کە تۆ فێری بوویت. ئایا لە نێوان ئەم گیانەوەرانە هیچ گیانەوەرێك هەیە سەر بە کۆمەڵەی ئەو گیانەوەرانە نەبێت کە لە بەندەکەدا هاتووە؟ سیفەتەکانی ئەو گیانەوەرە چییە؟

# بەندی ٢

# زیندەوەران لەکوێدا دەژین؟

## زاراوەکان

ژینگە
بیابان
هێڵی بەفری بەردەوام
دارستانی گەڵاوەریوو
دارستانی گەلاسەوز
ئاوی سوێر
ئاوی سازگار

زیندەوەران لە دەوروبەرماندا هەن لەهەوا و وشکانیدا و لەئاودا هەیە. لەم بەندەدا بۆت دەردەکەوێت کە هەندێ لەزیندەوەران لەکوێدا هەن و لەشییان و ڕەفتارییان چۆن یارمەتیان دەدات بۆ ئەوەی لەژینگەکەیاندا بژین.

### زانیارییەکی خێرا



ڕووەکی قووچەکی زەوی(ڕێحانە کێویلە) لەڕووەکە سەر سووڕهێنەرەکانە ،ئەم ڕووەکە بە تەواوی لە قووچەکی کاژ (سنەوبەر) دەچێت کە دەکەوێتە سەر زەوی زۆربەی گیانەوەر نایخۆن ئەم ڕێگەیەش بەسوودە بۆ خۆپاراستن.

## زانیارییەکی خێرا

نزیکەی(٢٥٠٠) گیانەوەری کەرکەدەنی ڕەش ماوە لەسەر زەوی بۆیە لەوانەیە مەترسی لە ناوچوونیان لێدەکرێت بەهۆی کەمی ژمارەیانەوە.

ئەوگیانەوەرانەی مەترسی لەناوچوونیان هەیە

| جۆری گیانەوەر | ژمارەیان |
| --- | --- |
| پاندای گەورە | ١٠٠٠ |
| بەرخی دەریا | ١٩٠٠ |
| کەرکەدەنی ڕەش | ٢٥٠٠ |
| پڵنگی ڕاوکەر | ١١٠٠٠ |

## وانەی ١

# ژینگەی بیابانیەکان چییە؟

لەم وانەیەدا



لێدەکۆڵینەوە
لە ژینگەی بیابانی

فێری
ژینگەی بیابانی دەبیت

زانست دەبەستێت
بە بیرکاری و دروستیەوە



## لێدەکۆڵمەوە

# ژینگەیەکی بیابانی دروست بکە

**ئامانج لە چالاکییەکە** بیابان شوێنێکی زۆر وشکە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ژینگەیە شوێنی ژیانی ژمارەیەکی زۆری زیندەوەرانە، لەم چالاکییەدا **نموونەیەك** بۆ ژینگەی بیابانی **دروست دەکەین.**

### کەرەستەکان

- کارتۆنێکی مقەبا
- پەڕەی نایلۆن
- دوو یان سێ ڕووەکی بیابانی
- چەو یان بەردی بچووك
- خاکێکی لمی

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. **نموونەیەکی** ژینگەی بیابانی **دروست دەکەم.** لەسەرەتا دا کارتۆنەکە لە ناوەوە بە پەڕەی نایلۆن دادە پۆشم. لمە خاکەکە لە ناو کارتۆنەکەدا دادەنێم و بڵاوی دەکەمەوە. بەمەرجێك خاکەکە گونجاو بێت بۆ جێگیرکردنی ڕووەکەکان.

٢. ڕووەکەکان لە خاکەکەدا بچەقێنە و تاوێری بچووك بەدەوریدا دابنێ. بڕێکی کەم ئاو بکە بەسەر خاکەکەدا(وێنەی أ).



► دووپشك جۆرێکە لەو گیانەوەرانەی کە لە بیاباندا دەژین.



وێنەی أ



وێنەی ب

٣ نموونەیی ژینگە بیابانییەکەی خۆت لە بەر هەتاودا دابنێ (وێنەی ب).

٤ **تێبینی** وشك بوونەوەی خاکەکە بکە ئەویش بە بەکارهێنانی پەنجەکانتەوە ڕۆژی یەك جار. ئەگەر خاکەکە بەتەواوی وشك بووە وە ،ئەوا ئاو پرژێنێکی کەمی بکە، وریابە ڕووەکەکان زۆر ئاو نەدەیت.

٥ بەردەوام بە لە **تێبینیکردنی** ژینگە بیابانییەکەی خۆت و چاودێری کردنی. تێبینیەکانت **تۆمار بکە**.

---

## دەرئەنجام

١. ئایا ئەو ژینگەیەی کە ئامادەت کردووە چ جۆرە ژینگەیەکە؟

٢. چۆن ئەو **نموونەییەی** کە خۆت دروستت کرد فێری ژینگەی بیابانت دەکات.

٣. **چۆن زاناکان کار دەکەن** زانایان بەزۆری لە **دروست کردنی نموونەوە** فێر دەبن. چ جۆرە ژینگەیەکی دیکە جگە لە ژینگە بیابانییەکە نموونەی بۆ دروست بکەیت.

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

**سەرنجدان** بۆ ژینگەی بیابان لەژووری پۆلەوە ئاسان نیە. بۆ ئەوەی زیاتر لە ژینگەی بیابانی ڕاستەقینە بگەیت، دەتوانیت ژینگەیەکی **نموونەیی** بیابان **دروست بکەیت**.



فێردەبم

# ژینگەی بیابانی

بناسە
- دوو جۆر لە بیابان.
- چۆن ڕووەك و گیانەوەران پێداویستیەکانی خۆیان لە بیابان پەیدا دەکەن.

**زاراوەکان**
ژینگە
بیابان

## جیاکەرەوەکانی بیابان

لە چالاکییەکەی پێشوودا نموونەیەك لە ژینگەی بیابانت تێبینی کرد. **ژینگە** ئەو شوێنەیە کە زیندەوەری تێدا دەژی لەگەڵ زیندەوەرانی تر و شتە نازیندووەکان پێکەوە.

**بیابان** بریتییە لەو ژینگەیەی کە بڕێکی زۆر کەم لە باران ساڵانە لێدەبارێت، کە کەمترە لە ٢٥٠ ملیمەتر. یان چەند ساڵێك بەسەردا تێپەڕ دەبێت بێ ئەوەی بارانی لێببارێت. هاوینی بیابانەکان لە ڕۆژدا زۆر گەرمە و لەشەونداگەرمی کەمترە.

لە ناوچەکانی نیمچە بیابانی لەتەك بیاباندا وەك لە کەرکوك و ڕۆژئاوای گەرمیان و باشوری هەولێر باران دەبارێت. بەڵام کەمترە لە ٣٥٠ ملیمەتر لە ساڵێکدا. هەرچی پلەی گەرمی تیایدا وەك ئەوەی لە بیاباندایە. ناوچەکانی نیمچە بیابانی نزیکەی نیوەی ڕووبەری هەرێمی کوردستانە.

✔ ژینگەی بیابانی بەچی جیادەکرێتەوە؟






▲شوێنێکی نیمچە بیابان لە کەرکوك

## ڕووەکە بیابانییەکان

لە ڕووەکە بیابانییەکاندا هەندێك بەش هەیە یارمەتی گلدانەوەی ئاو دەدەن. زۆربەی ڕووەکە بیابانییەکان ڕەگی درێژیان هەیە کە لە نزیك ڕووی زەویەوە بڵاو دەبێتەوە . ئەو ڕەگانە دەتوانن بە ئاسانی ئاو بمژن کاتێك کە باران دەبارێ. زۆربەی ڕووەکە بیابانییەکان قەدێکی ئەستووریان هەیە ئاوی لەناو کۆدەکەنەوە. هەندێك گیانەوەر ئەو قەدانە دەخۆن بۆ ئەوەی ئاوی پێویستیان بۆ ژیان دەست بکەوێت. هەندێك لە ڕووەکە بیابانییەکان وەك سوبێر گەڵای شێوە دڕکییان هەیە کە یارمەتی ڕووەکەکان دەدات بۆ وون نەبوونی ئاو لە ڕووەکدا.

هەندێ جۆری ڕووەکی ناوچەکانی نیمچە بیابان.

لەناوچەکانی نیمچەبیابانیدا ڕێژەی ڕووەکەکان بەرەبەرە لە زیادبووندا دەبێت هەرچەندە لە بیابان دووربکەوین. ئەوڕووەکانە دەوەنی بڵاوەبوو دەگرێتە خۆی کە برێکی کەم لە گیایی لە نێوانیاندا هەیە، بەتایبەت گژوگیایی دڕکاوی کە لە وێنەکانی سەرەوە دیاری کراون.

✔ چۆن ڕووەکە بیابانییەکان ئاویان دەست دەکەوێت؟

ڕەگەکانی سەرەوەی خاك بەخێرایی ئاوی باران دەمژن.

ڕەگی قوڵ دەگەنە شوێنی بوونی ئاو.



پارچە گەورەکانی کە لەوێنەکەدا دیارن لە ڕووەکی سەبار ئاو کۆدەکەنەوە.

ڕووەکی سنت.

# گیانەوەرانی بیابان

گیانەوەرانی بیابان زۆربەی ئەو ئاوەی دەستیان دەکەوێت، لەخواردنی ئەو ڕووەکانەوەیە کە ئاو کۆدەکەنەوە، یان بەهۆی خواردنی گیانەوەرانی ترەوەیە.

خشۆکەکانی وەك مار و مارمێلکە لەشوێنە سێبەرەکاندا دەژین لەڕۆژانی گەرمدا هەروەها دوپشك و مێرووله لە بیابانەکاندا دەژین،

ئەم گیانەوارنە پۆشەرێکی ڕەقیان هەیە کە ون بوونی ئاو لە لەشیان کەمدەکاتەوە. مەمکدارە بچووکەکان وەك شەمشەمەکوێرە و کەروێشك و مشك لە شەودا چالاك دەبن، ئەویش کە کەشی سارد دەبێ، بەڵام لە ڕۆژدا پەناگەیەك بۆ خۆیان دەدۆزنەوە، وە خۆیان لە تیشکی خۆر دەپارێزن. وە لە ناوچەکانی نیمچە بیابانیدا.

ژمارەیەکی زۆر لە گیانەوەری ڕووەك خۆر هەن وەك مامز، هۆکاری زۆریان بوونی گژوگیای زۆرە جگە لە ئاو کە سەرچاوەکەی کانی و گۆماوەکانە.

## ✔ چۆن گیانەوەرانی بیابان ئاویان دەست دەکەوێت؟



▲ مامز لە گیانەوەرانی ژینگەیی نیمچە بیابانییە.



▲ مارمێلکە لە سێبەردا لەکاتی ڕۆژدا







▲ کەوریێشك و جورجەکان بەشەو لە بیابانەدا چالاکن.

دووپشك و مێروو پۆشەرێکی ڕەقیان هەیە لە وشك بوون دەیانپارێزێت. ▼







مار بە پیستێکی سیرمەداری وشك هەڵاتوو داپۆشراوە پارێزگاری لە ناوی ناو لەشی دەکات.

## پوختە

ژینگە بیابانییەکان وشکە، بەڵام ژینگەی نیمچە بیابانی وشکی کەمترە. ڕووەك و گیانەوەرە بیابانییەکان، لەشیان پێکهاتووی ئەو تۆیان هەیە کە یارمەتیان دەدات بۆ پەیداکردنی پێداویستییەکانیان بۆ مانەوەیان لە ژینگەکانی نیمچە بیابانی ژمارەی ڕووەك و گیانەوەران لەو ناوچانە دەژین زیاترە.

## پێداچوونەوە

١. بیابان چییە؟

٢. ژینگەی بیابانی و نیمچە بیابانی بەچی لێك جیا دەبنەوە؟

٣. ڕووەکەکانی بیابانی ئاو لە کوێدا کۆدەکەنەوە؟

٤. گیانەوەرەکانی بیابانی ئاویان دەست دەکەوێ لە ڕێگای خواردنی ڕووەکەکان. کەواتە چۆن دەستیان دەکەوێ؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** زۆر لەو کێشانەی کە بەرەنگاری ئەو گیانەوەرانەی لە بیاباندا دەژین بریتین لە:

أ  گەرمی

ب  کەمی ڕووەکەکان

ج  کەمی ئاو

د  زۆری ئاو



گوێیەکانی ڕێوی بیابان یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی کە زوو هەست بە دوژمنەکانی بکات هەروەها یارمەتی دەدات لە ڕزگار بوون لە پلەی گەرمی زیادەی لەش بەهۆی ئەو پێستە تەنکەی کە دایدەپۆشێت.



## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە بیرکاری

### قەبارەی بپێوە

ڕووەکە بیابانییەکان ئاو کۆدەکەنەوە. بۆ ئەوەی بزانیت کە ئەو ڕووەکانە چەند ئاو کۆدەکەنەوە، پارچە میوەیەك بگوشە ناو دەفرێك، پاشان ئەو شلەیە (گوشراوە) بپێوە کە کۆت کردۆتەوە.



### بەستنەوە بە دروستی

### ئاو و دروستی

لەشت پێویستی بە ئاوی زۆرە کاتێك کەش و هەوا گەرم دەبێت .لەگەڵ هەڤاڵەکانتدا لیستێك بۆ پێنج شت تۆمار بکە کە یارمەتی هێشتنەوەی ئاو دەدەن لە لەشتدا لە ڕۆژێکی گەرم دا.



## لێدەکۆڵمەوە

# ژینگەیەکی شاخاوی دروست بکە

**ئامانج لە چالاکییەکە** ژینگەی شاخاوی بارودۆخی جیاوازی هەیە لە بەشە جیاجیاکاندا، لەبەرئەوەی پلە گەرمی دەگۆڕێت لە بناری چیا و سەرەوەیدا. ڕووەك و گیانەوەران کە لە ژینگەی شاخاوی دەژین جۆراوجۆرن بەپێ ی بەرزی ناوچەکانیانەوە. لەم چالاکییەدا ژینگەیەکی شاخاوی دروست دەکەیت.

### کەرەستەکان

- سینییەك
- قوڕی ڕەنگاوڕەنگ (قاوەیی، سەوز، خۆڵەمێشی، سپی)
- درەختی پلاستیکی بچووك (کاژ یان سەرو یان بەڕوو) یان وێنەی ئەم درەختانە
- ٥ خانوی بچوك یان وێنەی ٥ خانوی بچووك.

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە:

١ **نموونەیەکی ژینگەی شاخاوی دروست دەکەم.** قوڕی ڕەنگ سەوز لەسەر سینییەکە درێژ دەکەم وە بە ئەستوری ٢سم کە لێوارەکانی لار دەکەم.

وانەی ٢

# ژینگەی شاخاوی چییە؟

لەم وانەیەدا...

لێدەکۆڵیتەوە
لە ژینگەی شاخاوی

فێری
ژینگەی شاخاوی دەبیت

زانست دەبەستیت
بە بیرکاری و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان



► وێنەی گۆڕهەڵکەنە کە لە سمۆرە دەچێت، لەناوچە شاخاوییە بەرزەکان دەژیت. وە لەکاتی هاتنی زستانی سارد، دەچێتە کونەکەیەوە و دەنوێت تا هاتنی بەهار.



وێنەی أ



وێنەی ب

٢. قوڕەکەی دیکە بەشێوی چین چین ڕیزبکەوە لەسەر چینی ژێرەوەیدا **قاوەی** کراوە، لەدواییدا قاوەیی پاشان خۆڵەمێشی، ئینجا سپی لە لوتکەدا. لێواری ئەو چینانەی کە لەسەر یەکتریت داناوە بەشێوەیەکی لار بکەوە. بەم شێوەیە نموونەی شاخێك دروست دەکەیت (وێنەی أ)

٣. خانووە بچووکەکان لە دەوروبەری چینی ژێرەوەدا بچەسپێنە.

٤. لە ١٠ تا ١٥ ڕووەکی بەڕوو لەسەر چینی دووەم بچەسپێنە.

٥. لە ٨ تا ١٠ ڕووەکی بەڕوو یان کاژ لەسەر چینی سێیەم بچەسپێنە.

٦. با هەردوو چینی چوارەم و پێنجەم بەبێ ڕووەك بن. بەم شێوەیە نموونەیەکت دەبێت کە تیایدا ڕووەکەکان دابەش کراون لە ژینگەیەکی شاخاوی (وێنەی ب)

## دەرئەنجام

١. لەنێوان ناوچە شاخاویەکاندا هۆی جیاوازی لە جۆری دارستانەکان چییە؟

٢. لەبەرچی ژمارەی ڕووەکەکان لە چینەکانی سەرەوە کەم دەبن لە ژینگەی شاخاویدا؟

٣. لەبەرچی بەرزترین چین لە شاخدا لە قوڕی سپی دروستکرا؟

٤. **چۆن زاناکان کار دەکەن** زاناکان لەکاتی **دروستکردنی نموونەکان** فێر دەبن. چی فێر دەبیت لە ناوچەکانی دارستانی ئەم نموونەیە؟

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

لەوکاتەی کە **نموونەیەك دروست دەکەیت**، هەوڵ دەدیت کە نموونەکە زۆر لەشتی ڕاستەقینە بچێت. دەتوانی هەندێك شت فێربیت لەشتە بنچینەییەکەدا کە لە نموونەکەتدایە



فێردەبم

# ژینگەی شاخاوی

## جیاکەرەوەکانی ژینگەی شاخاوی

سێیەکی رووبەری هەرێمی کوردستان شاخاویە.

ساردی هەوا زیاد دەبێ لە کاتی بەرزبوونەوەمان لە شاخەکاندا. لەبەرئەوەی ساردی هەوا لە لوتکەی شاخەکان توند ترە وەك لە بنارەکەیدا، بڕی باران لە ناوچە شاخاویەکان زیاترە وەك لە ناوچەکانی دەوروبەریدا کە شاخاوی نین.

زۆربەی زۆری دابارینەکان لە ناوچە بەرزەکانی شاخەکان لە شێوەی بەفر دەبێ. وە لەبەر ئەوەی زۆر ساردە، بەفر بە درێژایی ساڵ دەمێنێت ئەمەش **هێڵی بەفریی بەردەوام** پێك دەهێنێت. دەبێت کە بەرزاییان زیاترە لە ۳٥۰۰م وەك لوتکەی چیای «هەڵگورد» بەرزی ئەم لوتکەیە دەگاتە ۳٦۰۷ م ئەویش بەرزترین لوتکەیە لە هەرێمی کوردستاندا.

✔ **چۆن ساردی هەوا لە ژینگەیەکی شاخاوی دەگۆڕێت؟**

بناسە

- ژینگەیەکی شاخاوی.
- چۆن جۆرەکانی ڕووەك و گیانەوەران دەگۆڕێن لەژینگەیەکی شاخاویدا.
- چۆن ڕووەك و گیانەوەران خۆیان دەگونجێنن لە ژینگەیەکی شاخاویدا.

**زاراوەکان**

هێڵی بەفری بەردەوام

دارستانی گەڵاوەریو

دارستانی گەڵاسەوز

▼ ناوچەی چۆمان شاخاویە. سەیری دارستانەکانی لای ڕاست بکە، لەو بەرزتر لەوەرگایە پاشان تاوێری ڕووتە، لەسەرەوە ناوچەی بەفرە.



# ڕووەك لە ناوچە شاخاوییەکاندا

لە چیاکانی هەرێمی کوردستان، لەبەر گۆڕانی گەرمی هەوا، ڕووەکەکان جۆراو جۆر دەبن لەگەڵ بەرزایی ناوچەکان. لەبەشەکانی ژێرەوەی چیاکانی هەرێم، دارستانەکان درێژ دەبن و داری بەڕووی ئاسایی باوە لەو ناوچەیەدا. لەگەڵ ئەم ڕووەکانە درەختی بەلالوک و سماق و دارەبەن گەشەدەکەن. لەسەر ناوچەی بەڕووی ئاسایی، دارستانی دیکە هەیە، کە داری بەڕووی مازی زۆرەو لەگەڵیدا درەختی عەرعەرو گێوژ گەشە دەکەن. لەگەڵ ئاستی ئەم ناوچەیە لە زاویتە و ئەتروش دارستانی ڕووەکی کاژ گەشە دەکات.

لە ناوچەی سەرەوەی ناوچەی بەڕووی مازی دارستانی بەڕووی دیندار هەیە. ئەو ڕووەکانە بەرگری ساردی دەکەن و گەشە دەکەن وەک کەوەت و دارەبەنی زبر.




▲ گەڵاکانی دەرزیلەیین وە تۆوەکانی لە ناو قوچەکەکان گەشەدەکەن.







▲ دابەشکردنی ڕووەکەکان لە ژینگەی شاخاویدا بەگوێرەی بەرزی دابەشکراوە.







▲ ڕووەکی کەوەت بەرگەی شەختە دەگرێ.




▲ دارستانی بەڕوو بەشێکی گەورەی دارستانەکانی هەرێمی کوردستان پێکدەهێنێت.







▲ ڕووەکی گوێژ و سماق لەنێوان ڕووەکی بەڕو گەشە دەکەن.

لای سەرەوەی ناوچەی دارستانەکان، ناوچەیەک گژوگیا دەڕوێت وەک حەزازەکان و بە ناوچەی گیایی و لەوەڕگاکان دەناسرێن.

لە بەرزتر چینێکی تاوێری ڕووت دێت و لە کۆتایی دا چینی بەفری بەردەوام دێت.

بەڵام دۆڵی ناوچە شاخاوییەکان و ڕێڕەوەکانی ئاوی ڕووبارەکان هەندێ جۆر لە ڕووەك گەشەدەکات کە ئاویان پێویستە، وەك گوێز و بیی و سپیندار.

## دارەکان دوو جۆرن

دارەکانی بەڕوو، و بیی و سپیندار و کەوەت لە ڕووەکە گەڵاوەریوەکانن. **ڕووەکی گەڵاوەریو** ئەو ڕووەکانەن کە گەڵاکانیان لە وەرزی پایز دەوەرن لەبەر هاتنی سەرما. لە بەهاری داهاتوو گەڵای نوێ گەشەدەکات.

داری کاژ لەو ڕووەکانەیە کە هەمیشە سەوزە. **ڕووەکی هەمیشە سەوز** ئەو ڕووەکانەن کە گەڵاکانیان هەڵناوەرێن لەیەك کات، بەڵکو بە بەردەوامی بە درێژایی ساڵ گەڵای سەوزی هەیە.

✔ چینەکانی ڕووەك لە خوارەوە تا سەرەوەی چیاکان بژمێرە؟


بیی


چنار


سپیندار

لە لێواری ئاوەکاندا ئەم ڕووەکانەی سەرەوە زۆر دەبن.

دۆڵێکی چیایی لە ناوچەکانی باکووری
لە لێواری ئاوەکاندا ڕووەکەکانی زۆر بە
جۆر گەشە دەکەن.

# گیانەوەر لە شاخەکاندا

لە چیاکان زۆر جۆر لە گیانەوەران دەژین لەوانە ڕووەك خۆرن و هەیانە گیانەوەری دیکە دەخۆن. وە لە چیایەکانی هەرێمی کوردستان زۆر جۆر لە گیانەوەران دەژین، لەوانە: بزنە کێوی کە لەو ناوچانە دەژین بەرزاییەکەی لە نێوان ١٥٠٠م بۆ ٢٠٠٠م بێ، بەوە جیا دەکرێتەوە کە سمەکانی نەرمن یارمەتی گواستنەوەی دەدات بە خێرایی و چەسپان لە ڕێگاکان و سەر تاوێرە لارەکان. هەروەها لە چیایەکانی هەرێمی کوردستان ژوژك و سمۆرە و کەروێشکی کێوی دەژین، هەموو ئەو گیانەوەرانە لەسەر ڕووەك دەژین. لەگەڵ ئەم گیانەوەرانە دوژمنەکانیان لە سروشتدا دەژین لە گیانەوەرانی گۆشت خۆر وەك گورگ، ڕێوی و چەقەڵ و کەمتیار و ورچە بۆر.




بزنە کێوی دەتوانێ بەسەر ناوچە لارەکان بکەوێ.







▲ گیانەوەری شاخاوی ڕووەك خۆر

گیانەوەری شاخاوی گۆشت خۆر ▼

















هەروەها لە ناوچە شاخاوییەکاندا باڵندەی وەك کەو ، بازی بۆر هەیە، هەموویان باڵندەی خۆجێن وەهەروەها لەم ناوچانە باڵندە کۆچکەرەکان هەن کە لە شوێنی گەرم دێن وەك باڵندەی لەق لەقی سپی.

لەگەڵ نزیك بوونەوەی وەرزی زستانی سارد لە ناوچەکانی بەرز هەندێ جۆری شیردەرەکان کە لەم ناوچانە دەژین کۆچ دەکەن بۆ ناوچەکانی ناوەند و یان نزم کە زیاتر فێنکن. ئینجا لە وەرزی بەهار دووبارە دەگەڕێنەوە ژینگەکەی پێشوویان. وە هەندێ لە قرتێنەکان شوێنی حەوانەوە بۆ خۆیان دروست دەکەن لەژێر بەفرەوە، لەناویدا دەنوێت بە درێژایی زستان، وە لەکاتی هاتنی بەهار دەگەڕێتەوە چالاکی خۆی.

✔ **ڕێگایەك بڵێ گیانەوەرەکانی ناوچە بەرزە ساردەکان، لە وەرزی زستان کە دەگرنەبەر بۆ ئەوەی بەرگری لە سەرمای زستان بکەن.**



بازی بۆر



کەو



لەق لەقی سپی

ئەو باڵندانەی کە بەناوبانگن لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان.



نووستنی هەندێ جۆری گیانەوەران لە وەرزی زستاندا.



کۆمەڵێك لە گیانەوەرەی کۆچکەر بۆ شوێنێکی گەرمتر

## پوختە

هەرچەندە بەرزی ناوچە شاخاوییەکان زۆرتربێ هەوا ساردتر و بڕی بارانیش زیاتر دەبێ.
دابارینەکانی ناوچەکانی بەرزی شاخەکان شێوەی بەفر وەردەگرن. وە ڕووەکەکان دابەش دەبن لە ژینگەی شاخاوی بۆ چەند چینێك. لەبەر زیادبوونی ساردی ناوچەکان. لە ژینگەی شاخاویدا گیانەوەری جیاواز دەژین هەندێکیان لەسەر ڕووەك دەژین و هەندێکی تریان گۆشت خۆرن.

## پێداچوونەوە

١. چۆن بڕی ڕێژگەکان دەگۆڕێن لە نێوان ناوچەکانی ژینگەی شاخاویدا؟

٢. چۆن جۆرەکانی ڕووەك دابەش دەکرێن لە ژینگەی شاخاویدا؟ ئەم جۆرە دیاریکردنە چۆن دەبێ؟

٣. باسی ڕێگایەکی خۆپاراستنی گیانەوەران بکە لەژینگەی شاخاوی لە گۆڕانکارییەکانی بارۆدۆخی ژینگە.

٤. لەبەرچی ڕووەك لە ناوچەکانی بەفری بەردەوام لە شاخەکاندا ناڕوێن.

٥. ئامادە کاری بۆ تاقیکردنەوە: کام لەم ڕووەکانەی خوارەوە لە ناوچەکانی خوارەوەی شاخەکان گەشەدەکات.

أ ڕووەکی کاژ     ج ڕووەکە قوچەکییەکان
ب ڕووەکی کەوەت     د حەزازەکان



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### ستوونە داتاییەکان

لەسەر بنەمای ئەم خشتەیەی خوارەوە وێنەی ستوونە داتاییەکان بکێشە. کەوا دەکات بتوانی بەراورد لە گۆڕانکاری کە ڕوودات لە بەرزی هێڵی بەردەوام بکەیت لەگەڵ ناوچەجیاوازەکانی جیهان دا.

| ناوچەی شاخاوی | بەرزی هێڵی بەفری |
|---|---|
| ڕۆژهەڵاتی هیمالایا | ٤٥٠٠ م |
| ڕۆژ ئاوای وڵاتەیەکگرتوەکان | ٣٥٠٠ م |
| خواروی نەرویژ | ١٠٠٠ م |
| ئەلب | ٢٨٠٠ م |
| هەلگورد | ٣٦٠٧ م |



بەستنەوە بەلێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان

### ڕاپۆرت

فلیمێك ببینە لەسەر ناوچەیەکی شاخاوی لە هەرێمی کوردستان. لەم ناوچەیەدا ڕووەکی جۆراوجۆر گەشەدەکەن.
ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەم ڕووەکانە بنووسە کام جۆر زیاترە. لە ڕاپۆرتەکەدا وێنەی گەڵای هەندێ لەو ڕووەکانە بکێشە.

وانەی ٣

# ژینگە ئاوییەکان چین؟

لەم وانەیەدا . . .

**لێدەکۆڵیتەوە**
دەربارەی ژینگەی ئاوی سازگارە.

**فێربی**
دوو جۆر لە ژینگەی ئاوی دەبیت

**زانست دەبەستێت**
بە بیرکارییە و لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی.



## لێدەکۆڵمەوە

# ژینگەیەکی ئاوی سازگار دروست بکە

**ئامانجی چالاکییەکە** تۆ دەزانیت کە چەند جۆرێك ڕووەك و گیانەوەر لە گۆماو ودەریا چەکاندا دەژین، گۆماو و دەریاچەکان دوو ژینگەی ئاوی سازگارن. لەم چالاکییەدا نموونەیەك دروست دەکەی کە ژینگەی ئاوی سازگار بنوێنێت.

### کەرەستەکان

- حەوزێکی ماسی یان دەفرێکی پلاستیکی ڕوون و گەورە
- پەڕە کاغەز
- ڕووەك لە ئاوی سازگاردا بژێت
- تاوێر
- ماسی
- لم
- ئاوی سازگار
- چەو

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ لە بنکی حەوزەکەدا چینێك چەو دابنێ، لە سەرووی چەوەکەوە چینێك لم دابنێ.



دۆلفین لە ژینگەی ئاوی سوێردا دەژی و یاری و مەلە دەکات



وێنەی أ



وێنەی ب

٢ حەوزەکە لە شوێنێکی کەم خۆرەتاودا دابنێ، پارچە کاغەزێك لەسەر لمەکە دابنێ پاشان بە هێواشی ئاوی تێ بکە. دڵنیابە کە ئاوەکە دەکەیتە سەر کاغەزەکە تاکو لمەکە لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە (وێنەی أ)

٣ پەڕە کاغەزەکە بە هێواشی دەربهێنە ڕووەکەکان بچەقێنە و تاوێرەکانیش لەناو حەوزەکە دابنێ. واز لە حەوزەکە بهێنە بۆ ماوەی یەك هەفتە تاکو جێگیر دەبێتەوە دوای هەفتەیەك ماسییەکان بکەرە ناو حەوزەکەوە (وێنەی ب).

٤ سەرنجی ژینگەی ئەم ئاوە سازگارە بدە و گرنگی پێ بدە.

## دەرئەنجام

١. هەندێك لەو شتانە چین کە تێبینیت کرد لەو ژینگە ئاوە سازگارەی کە دروستت کردبوو؟

٢. بەڕای تۆ بۆچی ماوەیەك چاوەڕوان دەکەی پێش ئەوەی ماسییەکان بخەیتە ناو حەوزەکەوە؟

٣. **چۆن زاناکان کاردەکەن** زاناکان بەزۆری نموونەی ژینگەیەك ئامادە دەکەن بۆئەوەی لە تاقیگەدا سەرنجی بدەن، چۆن ئەو نموونەیەی دروستت کرد یارمەتیت دەدات بۆسەرنجدانی ژینگەی ئاوی سازگار؟ ئەو نموونەیەی کە دروستت کرد چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ گۆماوێکی ڕاستەقینە؟

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

تێبینی کردنی هەموو ئەو زیندەوەرانەی کە لە گۆماوێکدا یان لە دەریاچەیەك لە ئاوی سازگاردا دەژین. ئاسان نیە بۆ ئەوەی دەربارەی گۆماوێك یان دەریاچەیەك فێرببیت دەتوانیت نموونەیەك دروست بکەیت کە ژینگەی ئاوی سازگار بنوێنێ.



فێردەبم

# ژینگە ئاوییەکان

## جۆرەکانی ژینگەی ئاوی

ئاو زیاتر لە ٧٥٪ ڕووی زەوی دادەپۆشێت. زۆربەی ئەم ئاوە، ئاوی دەریاو زەریاکانە. دەریاو زەریاکان **ئاوی سوێریان** تێدایە، واتە ئەو ئاوەی کە بڕێکی زۆر خوێی تێدایە. ئەو شوێنانە ناو دەبرێت بە ژینگەی ئاوی سوێر لە چالاکی پێشودا. نموونەیەك بۆ ژینگەی ئاوی سازگار دروست کرا. **ئاوی سازگار** بەو جۆرە ئاوە دەوترێ کە بڕێکی زۆر کەم خوێی تێدایە ، ڕووبارو وگۆماو و زۆربەی دەریاچەکان و ژینگەی ئاوی سازگارن.

✔ دوو جۆر لەژینگەی ئاوی بڵێ.

**بناسە**

- ژینگەکانی ئاوی سازگار و ئاوی سوێر
- ئەو ڕووەك و گیانەوەرانەی کە لەژینگە ئاوییەکاندا دەژین.

**زاراوەکان**

ئاوی سوێر
ئاوی سازگار




بەشە شینەکانی ئەم نەخشەیە ژینگە سەرەکییەکانی ئاو لە جیهاندا نیشان دەدات ◄

## ژینگەی ئاوی سوێر

زۆر ژینگەی ئاوی سوێر هەیە، چونکە ئاوی سوێر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە . بڕی خوێ لە ئاوی زەریاکاندا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری زەریاکە جیاوازە.

ئاوی باران وا لە ئاوی ڕووی زەریاکان دەکات کە سوێرییان کەمتربێت هەروەها ئاوی نزیك بە کەنارەکان خوێی کەمیان تێدایە چونکە ئاوی ڕووبارەکانی تێ دەڕژێت

بەڵام ئاوی زەریاکان لە هەر شوێنێکدابن بڕی خوێیان تێدا زیاترە وەك لە ئاوی سازگار ئاوی ڕووی زەریاکان یان نزیك بە کەنارەکان گەرم ترە وەك لە ئاوی قوڵاییەکانی زەریا چونکە خۆر، ئاوەکان گەرم دەکات لەو ناوچانەدا .

✔ **بۆچی ئاوی زەریاکان لە نزیك کەنارەکان سوێریان کەمترە؟**

بارنەکلەکان گیانەوەری بچووکن خۆیان بە تاوێرەکان و شتەکانی دیکەوە هەڵدەواسن.

جۆری جیاوازلە ڕووەك گیانەوەران لە ئاوی شلەتێن و تەنکاودا دەژین



هەندێك گوڵاڵەی دەریا لە ئاوی شلەتێن و تەنکاودا دەژین.

## ژینگەکانی زەریا

زەریاکان بە گەورەترین ژینگەی سەر زەوی دا دەنرێن لەبەر ئەوە ژمارەیەکی زۆر ڕووەك و گیانەوەری تێدا دەژی هەموو ئەم زیندەوەرانە خۆیان گونجاندووە بۆ ئەوەی لە ئاوی سوێردا بژین. بەشەکانی زەریا لە یەك ناچن. سوێری ئاوەکانیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە. وە ئاو لە هەندێ شوێن کەم قووڵە و تیشکی خۆری دەگاتێ و قووڵە لە هەندێك شوێنی تر و تیشکی خۆری ناگاتێ. هەروەها پلەی گەرمی لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازە. گشت ئەم جیاوازییانە لەگەڵ ئەو قووڵاییەی کە تیشکی خۆر دەیگاتێ کار دەکەنە سەر جۆرەکانی ئەو زیندەوەرانەی کە لە بەشە جۆراو جۆرەکانی زەریادا دەژین .

✔ **گیانەوەرەکان و ڕووەکەکانی زەریا بە چی هاوبەشن؟**

## تیشکێك لەسەر بابەتەکە

### ناوچەکانی زەریا

دەتوانرێت زەریاکان بکرێن بە چەند ناوچەیەك و دیاری کردنی ئەو ناوچانە بە پێی گەیشتنی بڕی تیشکی خۆر دەبێت بۆ ئەو ناوچانەی کە زۆرترین ڕۆشنایی خۆریان دەگاتی پلەی گەرمیان بەرزە بەمەش بەشی زۆری ژیانی زیندەوەر (ڕووەك و گیانەوەران) لەوناوچانەدا دەبێت بەڵام ئەو ناوچانەی کە بڕێکی کەم ڕۆشنایی خۆریان دەگاتێ، تاریك دەبن و ژمارەیەکی زۆر کەم لە گیانەوەرو ڕووەکیان تێدا دەژی و ئاوەکەیان زۆر سارد دەبێت.



داستانی قەوزەکان لەم ئەتکاوانە گەشە دەکەن. ئەمانەش خۆراك و پەناگە بۆ زۆر جۆر ماسی و گیانەوەری ئەو ناوچەیە دابین دەکەن

ئەم ماسییە کەمەرەییانە لەئاوی گەرمدا دەژین.



لەتەنکاوەکانی نزیک کەناری زەریاکان رۆشنایی خۆر دەگاتە بنکی ئاوی زەریاکە بەمەش ڕووەکێکی زۆر لەو ناوچەدا دەژی. هەروەها گیانەوەرانیش لەم ناوچەیە دا دەژین کە ئەو ڕووەکانە دەکەنە خۆراکی خۆیان.

تاکو لە کەنارەکانی زەریا دوور بکەوینەوە ڕۆشنایی خۆر ناگاتە بنکی ئاوەکان.

هەر لەبەر ئەوە ڕووەکەکان سەر ئاو دەکەون لەو ناوچانەی زەریادا بۆ ئەوەی ڕوشنایی خۆریان بەر بکەوێت بەهەمان شێوە گیانەوەرانیش لە نزیک ڕووەکەکانەوە مەلە دەکەن بۆ ئەوەی لەسەر ئەوڕووەکانە بژین. ئەو گیانەوەرانەی کە گۆشت خۆرن نزیک بە گیانەوەرەکانی تری ئەو ناوچەیە دەبن

ماسی قولاب لەناوچە قووڵەکانی زەریادا دەژی



ڕۆشنایی خۆر ناگاتە بنکی زەریا قووڵەکان هەر لەبەر ئەوە ژمارەیەکی زۆر کەم ڕووەك لەو ناوچانەدا دەژین و ئاوی ئەم ناوچانە زۆر ساردە لەبەر کەمی ڕووەك ئەو گیانەوەرانەی لە ناوەقووڵەکاندا دەژین ژمارەیان زۆر کەمە

## ژینگەی ئاوی سازگار

ژینگەی ئاوە سازگارەکان لەیەکترناچن. ئاشکراترینییان ڕووبار و کانیاو دەریاچەکان و گۆماوەکانن.

زۆر جۆر لە ڕووەك و گیانەوەر لەڕووبار یان دەوروبەریدا دەژین. ئاوی ڕووبارەکان بە خوڕ یان بەهێواشی دەجوولێت، هەروەها جۆری ئەو زیندەوەرانەی لەئاوی ڕووبارەکاندا دەژین جیاوازن بەپێ ی خێرایی جوولەی ئاوەکە.

ئاوی گۆماو دەریاچەکان مەنگن هەروەك لە زەریاکاندا، زۆربەی ڕووەك و گیانەوەران لە ئاوە کەم قولەکانی گۆماو و دەریاچەکاندا دەژین، کەمێکیان لە شوێنە قوڵەکان دەژین کە ڕۆشناییان ناگاتێ.



کیسەڵ گیانەوەرێکی باوە لە لێواری گۆماو و ڕووبارو زۆنگاو و دەریاچەکاندا دەژیت.

✔ دوو جۆر لە ژینگەی ئاوی سازگار بژمێرە؟



شینە شاهۆ باڵندەیەکی خۆ نوقم کەرە لە نزیك ئاوە سازگارەکاندا دەژی وەك دەریاچەکان .



کرمۆکەی مێشی مایۆ خۆی بە تاوێرێك یان ڕووەکێك دەنووسێنێت بۆ ئەوەی ئاوە خێراکان لەگەڵ خۆیاندا ڕایان نەماڵن.



ماسی سەلوور لە بنکی دەریاچەکاندا دەژی

## پوختە

ژینگە ئاوییەکان لەوانەیە سازگار بن یان سوێر. زەریاکان ژینگەیەکی ئاوی سوێرە بەڵام ڕووبارو جۆگەو دەریاچە و گۆماو ژینگەی ئاوی سازگارن. ڕووەك و گیانەوەرە جۆراوجۆرەکان لە ژینگە ئاوییە جیاوازەکاندا دەژین.

## پێداچوونەوە

١. دوو جۆر ژینگەی ئاوی بژمێرە، هەروەها دوو جیاوازی نێوانیان بڵێ؟

٢. زۆربەی گیانەوەرانی ناوگۆمەکان لە کوێدا دەژین؟

٣. کام ناوچەی زەریا کەمترین بڕی ڕۆشنایی خۆری دەگاتێ؟

٤. چی بەسەر ئەو ڕووەك و گیانەوەرانەدێت کە لە ژینگەیەکی ئاوی سوێر دەژین کاتێك تووشی لافاوی ئاوی سازگار دەبن.؟ وەڵامەکەت روون بکەرەوە.

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** کام لەم ژینگانەی خوارەوە ژینگەی ئاوی سازگار نییە؟

أ ڕووبار

ب دەریاچە

ج گۆماو

د زەریا



## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە بیرکارییەوە

**وێنەیەکی داتایی جێبەجێ بکە**

کۆمپیوتەر بەکار بهێنە بۆ ئامادەکردنی وێنەیەکی ڕوون کردنەوە بە شێوەی ستوون بۆنیشاندانی قووڵیی ئەم ئاوانەی خوارەوە ڕووبار (١)مەتر قووڵ بێت ، دەریاچەیەك (٦) مەتر قووڵ بێت، زەریایەك (١٢٢) مەتر قووڵ بێت . ئایا قووڵی زەریا چەند ئەوەندەی قووڵی دەریاچەکەیە؟



### بەستنەوە بەلێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵایەتی

**ژینگەی ئاوە سازگارەکانی هەرێمی کوردستان**

نەخشەیەك بۆ ژینگەکانی ئاوی بکێشە لەسەر نەخشەی هەرێمی کوردستان ناوی سێ ناوچەی جیاواز دیاربکەکە ئاوی سازگاری تێدایە. وە سیفەتی هەریەکە لە ڕووبەر و قوڵایی دیاربکە. هەروەها دیاریکردنی بەشێك لە ڕووەك و گیانەوەرانی کە تێدا دەژین. هەموو ئەمانە بەشێوەی ڕاپۆرت پێشکەشی هاورێکانت بکە.



# ـەندی ٢ پێداچوونەوەو ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

ئەم زاراوانەی کە لە خوارەوە نووسراون بەکاربێنە بۆ تەواو کردنی ڕستەکان لە (١تا٧)، ژمارەی لاپەڕەکەی تۆمارکراو لە نێوان ( ) شوێنی بوونی زانیارییەکان لە بەندەکەدا نیشاندەدات کە لەوانەیەپێویستیت پێیان هەبێت.

ژینگە (٤٢)
بیابان (٤٢)
ئاوی سوێر (٥٦)
ئاوی سازگار (٥٦)
هێڵی بەفری بەردەوام (٤٨)
دارستانی گەڵاوەریوو (٥٠)
ڕووەکی هەمیشە سەوز (٥٠)

١. ژینگەی زۆر وشك بریتییە لە ________ .

٢. ________ بە درێژایی ساڵ گەڵای لەسەر دەمێنێتەوە.

٣. ________ بریتییە لە هەر شتێك دەوری زیندەوەر بدات.

٤. ئاوی زەریا ________ .

٥. بە درێژایی ساڵ بەفر دەمێنێت لە چیاکاندا لەسەر________ .

٦. ڕووبار و زۆربەی دەریاچەکان ژینگەی. ________

٧. ئەو ڕووەکانەی هەموو گەڵاکانی لە وەرزی پایز وون دەکات، بریتییە لە ________ .

## بەستنەوەی چەمکەکان

ئەم دەستەواژانەی خوارەوە لە شوێنی گونجاوی نەخشەی چەمکەکان بنووسە

ڕۆشنایی خۆر    ئاوی سوێر    بڕی خوێ    پلەی گەرمی



## دڵنیا بوون لە تێگەیشتن

بازنەیەك بە دەوری پیتی هەڵبژاردەی گونجاودا بكێشە.

١. باران لە بیاباندا دەبارێت ________ .
أ سالآنە.
ب هەر پێنج ساڵ جارێك.
ج بە بڕێكی زۆر.
د بە بڕێكی زۆر كەم.

٢. دوو جۆرەكەی ژینگەی ئاوی چیین؟
أ سازگار ، سوێر
ب گەرم ، سارد
ج گەرم ، وشك
د ڕووناك ، تاریك

٣. ڕووەكەكانی ژینگەی ئاویی دەژین ________ .
أ لە هەموو قولاییەكان.
ب لە ناوچە تاریكەكان.
ج لە ناوچە روناكەكان.
د لەسەر رووەكاندا.

٤. زۆربەی گیانەوەرەكانی بیابان چالاك دەبن لە ________ .
أ رۆژدا.
ب شەودا.
ج هاوین دا.
د هەمووكاتێكدا.

٥. لە كوێ گەشەی دارستان بەرگەی ساردی زۆر سەختتر دەگرێت؟ ________ .
أ دارستانی بیابانی.
ب دارستانی گەڵاوەریوەكان.
ج دارستانی قوچەكیەكان.
د دارستانی نیمچە بیابانی.

### وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەوە

٦. كەی گەڵاكان دەكەون لە دارستانی گەڵاوەریوەكان؟ لەبەرچی؟

٧. ئەو كێشەیەی كە تووشی زیندەوەری بیابان دەبێت چیە، كەچی تووشی زیندەوەری دەریاچەكان نابێت.

## پێداچوونەوەی كارامەییە كردەییەكانی زانست

لە هەردوو وانەی ١ و ٣ دا دوو نموونە بۆ ژینگەی بیابان و گۆماو دروست كرا، ئەو دوو ڕێگەیە چۆن یارمەتییان دایت بۆ زانینی جیاكەرەوەكانی ئەو دوو ژینگەیە؟

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

**وێنەی هێڵكارییەكی ژینگەی زەریا بكێشە**

لەگەڵ دوو یا سێ هەڤاڵتدا لە سەر پەڕەیەكی گەورە، ناوچەكانی زەریا دیاری بكرێت، بۆیان ڕوون بكەوە پاشان وێنەی دوو جۆر لەو گیانەوەرانە بكێشە كە لە هەر ناوچەییەكیاندا دەژین.



# بەندی ٣

# زیندەوەران پشت بە یەکتر دەبەستن

تۆهەروەك زیندەوەرانی تر پشت بە ڕووەك و گیانەوەران لە ژینگەکەتدا دەبەستیت بۆدەست کەوتنی پێویستییەکانت بەرهەمەکانی ڕووەك و گیانەوەران دەخۆیت، ئەوکەلوپەلانە بەکاردەهێنیت کە لە دار دروست کراون هەروەها ئەو پۆشاکەی لەبەر دەکەیت کە لە ریشاڵی ڕووەکی دروست کراوە. ڕووەك و گیانەوەران پشت بەیەکتر دەبەستن بۆ دەست کەوتنی پێداویستییەکان.

## زاراوەکان

- کار لە یەکتر دەکەن
- بەرهەمهێن
- بەکارهێن
- ڕووەکخۆر
- گۆشتخۆر
- هەمەچەشنە خۆر
- شیکەرەوە
- زنجیرەی خۆراك
- قوچەکی وزە

### زانیارییەکی خێرا



ئەسپی دەریا لە ڕووبارەکانی ناوەڕاستی ئەفریقادا دەژیت و لە سەر گژوگیاو ڕووەکە ئاوییەکان دەژی .ئەو پاشەڕۆکانەی کە دەریدەکاتە دەرەوە دەوڵەمەندە بە مادەی بژێوی بەسوود کە یارمەتی ڕووەکەکان دەدات بۆ گەشە.

## زانیارییەکی خێرا

چڕی زیندەوەران جیاوازە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تری جیهان . ئەگەر بتەوێت کە ژمارەی زیندەوەرانی ناوچەیەك بزانیت ئەوا بەراوردی ئەو ڕووەکانەی کە لەو ناوچەیەدا دەژین بکە بە ناوچەیەکی تر.

**ماددە ڕووەکییەکان لە ژینگە جیاوازەکاندا**

| ناوچە | ماددە ڕووەکییەکان لە مەتر دووجادا |
| --- | --- |
| دارستانی باراناوی | ٢٠٠٠ گرام |
| زەوییەگیاییەکان | ٨٠٠ گرام |
| بیابان | ٨٠ گرام |

وانەی ١

# چۆن زیندەوەران خۆراکیان دەست دەکەوێت؟

لەم وانەیەدا . . .



لێدەکۆڵیتەوە
چۆن گیانەوەران ددانیان بەکار دەهێنن بۆ دەسکەوتنی خۆراك



فێردەبی
چۆن زیندەوەران خۆراکیان دەست دەکەوێت



زانستەکان دەبەستیت
بە بیرکاری ودروستییەوە





## لێدەکۆڵمەوە

## ددانی گیانەوەران

**ئامانج لە چالاکییەکە** قەپ لە سێوێك بگرە کام ددانت بە کار هێنا ؟ کام ددانت بە کار دەهێنی تاکو سێوەکە بخۆیت .لەم چالاکییەدا دەبینیت شێوەی ددانەکان لەلای گیانەوەرەکان جیاوازن.

### کەرەستەکان

- کارتی پێرست
- کتێب لەسەر گیانەوەران

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ سەرنجی وێنەی گیانەوەران بدە بەوردی سەیری شێوەی ددانی هەر گیانەوەرێکیان بکە.

٢ کارتی پێرست بەکاربهێنە بۆهەرگیانەوەرێك لەسەر کارتەکان ناوی گیانەوەرەکە بنووسە و شێوەی ددانەکانی وێنە بکێشە.



ماسی قرش



پشیلەیەکی کێوی

گیانەوەرە ماڵییەکان بەهۆی مرۆڤەوە خۆراکیان دەست دەکەوێت .بەڵام گیانەوەری کێوی بەخۆیان بە دوای خۆراکدا دەگرێن.

٣ لەگەڵ هەڤاڵێکتدا لستێك لەو وشانە ئامادە بکە کە باسی شێوەی ددان دەکات ئەو وشانە بنووسە لە سەر کارتی پێڕست لەگەڵ وێنەی گونجاودا دایبنێ (وێنەی أ).

٤ بیر لە وە بکەوە کە هەرگیانەوەرێك چی دەخوات بۆئەو مەبەستە پشت بەو کتێبانە ببەستە کە تایبەتن بە گیانەوەر ئەگەر پێویستی کرد لە سەر پشتی کارتەکە لیستێکی ئەوشتانە بنووسە کە هەرگیانەوەرێك دەیخوات

وێنەی ١

## دەرئەنجام

١. کام جۆر لە گیانەوەر ددانەکانیان بۆ ڕاوکردنی گیانەوەرانی تر بەکاردەهێنێ کام جۆر لە گیانەوەران ددانەکانیان بۆ خواردنی ڕووەك بەکاردەهێنن؟ باسی بکە.

٢. هەندێك گیانەوەر ددانەکانیان بۆمەبەستی دی. بەکار دەهێنن سەرنجی ددانی قوندس بدە کە چۆن ددانەکانی بەکاردەهێنێت بۆ بڕینی دارو لە دروست کردنی پەناگەی بەکاریدەهێنێت.

٣. **چۆن زاناکان کار دەکەن** زاناکان بە تێبینی کردن فێر دەبن کە گیانەوەران چۆن ددانەکانیان بە کار دەهێنن، لە کاتی چاودێری کردنیان تێ دەگەن، کە ئەو گیانەوەرانە چۆن دەخۆن و چی دەخۆن. لەم چالاکییەدا، ئەوەی تێبینیت کردووە، چیت بۆ دەرکەوتووە دەربارەی شێوەی ددانەکانی گیانەوەر؟

**کارامەییە کردەییەکانی زانست**

تێبینی کردن لە دەرئەنجام جیاوازە. کاتێك تێبینی دەکەیت هەستیارەکانت بەکاردەهێنی، کاتێك دەرئەنجام دەهێنی بیرۆکەیەك پەیدادەکەیت بەهۆی تێبینی کردنەوە.

▼ گورگ

▼ ئەسپ

▼ قوندس «مشکی ئاو» - سەگلاو-



## فێردەبم

# زیندەوەران و خۆراك

بناسە

- چۆن زیندەوەران خۆراکیان دەست دەکەوێت
- چۆن ڕووەك و گیانەوەر لەگەڵ ژینگە کارلەیەك دەکەن.

زاراوەکان

کار لە یەکتر دەکەن
بەرهەمهێن
بەکارهێن
ڕووەکخۆر
گۆشتخۆر
هەمەچەشنە خۆر
شیکەرەوە

## بەرهەمهێنان و بەدەستکەوتنی خۆراك

لە چالاکییەکەی پێشوودا فێربوویت کەددانی گیانەوەران لەگەڵ ئەو خۆراکەی کە دەیخوات گونجاوە بەڵام هەموو زیندەوەران ددانیان نیە. هەندێك زیندەوەری تر خۆراکیان بە ڕێگەی دیکە دەست دەکەوێت بۆنموونە باڵندە، دەنووکیان بەکاردەهێنن بۆ خواردن وە ڕووەك بەخۆی خۆراکی بەرهەم دێنێت ڕووەك و گیانەوەر پێکەوە **کارلێکدەکەن** لەگەل ژینگەکەیان . بۆ بە دەستکەوتنی پێویستیەکانی. ڕووەکەکان لەگەڵ ڕۆشنایی و هەوا و ئاو کارلێك دەکەن بۆ بەرهەمهێنانی خۆراك. وەگیانەوەر لەگەڵ ڕووەکەکان یان لەگەڵ گیانەوەرانی دیکەدا بۆ دەستکەوتنی خۆراکەکەیان.

✔ بۆچی ڕووەك وگیانەوەران لەگەڵ ژینگەدا کار لە یەکتر دەکەن؟

ڕووەکی شلیك وزەی خۆر بەکار دەهێنێت لەبەرمهێنانی خۆراکەکەیدا



ئەم سمۆرەیە شلیك دەخوات بۆ بەدەستکەوتنی وزەی پێویست بۆ ژیان



کاتێك مار سمۆرە دەخوات ،وزەی پێویستی لێ وەردەگرێت



## بەرهەمهێنەکان

ڕووەك بەرهەمهێنن. **بەرهەمهێن** ئەو زیندەوەرە یەکە خۆی خۆراکی خۆی دروست دەکات. بەرهەمهێنەکان خۆراك بەکار دێنن بۆ ئەوەی بژین و گەشە بکەن.

ڕووەکەکان خۆراکی زیاتر لە پێویستی خۆیان بەرهەمدەهێنن ئەو خۆراکەی کە زیادەیە لە ڕەگ و گەڵا و تۆو بەردا کۆدەکەنەوە مرۆڤ و گیانەوەران ئەو خۆراکە کۆکراوەیە دەخۆن.

✔ بەرهەمهێن چییە؟

## بەکارهێنەکان

گیانەوەران ناتوانن خۆراك بۆخۆیان بەرهەم بهێنن، ئەو گیانەوەرانە بەکارهێنن. **بەکارهێن** ئەو زیندەوەرەیە کە زیندەوەرانی دیکە دەخوات هەندێك لە بەکارهێنەکان بە تەنها هەر ڕووەك دەخۆن بەمانەش دەووترێت. **ڕووەك خۆرەکان** بۆنموونە بزن و مەڕ ڕووەك خۆرن.



سەرچاوەی ئەم خۆراکانە ڕووەکە، ڕووەکەکان بەرهەمهێنن خۆیان خۆراك بۆخۆیان دروست دەکەن پاشان گیانەوەرانیش دەیان خۆن



مانگایەك گیا دەخوات.



بەرخ بەکارهێنە ڕووەك دەخوات.

هەندێك گیانەوەر گیانەوەری دیكە دەخوات كە راویان دەكات بەم جۆرە گیانەوەرانە دەوترێت **گۆشت خۆرەكان**. ئەم گیانەوەرانەش چەند ئەندامێكی لەشیان یارمەتییان دەدات كە نێچیرەكانیان بگرن و بیانخۆن بۆ نموونە باز، چڕنووكی چنگەكانی ودەنووكی تیژو بەهێزەكەی یارمەتی دەدات بۆپارچەكردنی گۆشت هەندێك گیانەوەر ڕووەك خۆر وگۆشت خۆرن چونكە ئەمانە لەسەر ڕووەك وگیانەوەر دەژین پێیان دەڵێن **هەمەچەشنەخۆر**. بۆ نموونە: كیسەڵ توو و مێرو دەخوات.

✔ **بەكارهێن چییە ؟**



ئەم بازە گیانەوەری بچووك ڕاودەكات بۆ دەستكەوتنی خۆراكی ▼

## شیكەرەوەكان

**شیكەرەوە** ئەو زیندەوەرانەن كە مادده مردووەكان و پاشەڕۆكەكان هەڵدەوەشێنێت بۆ دەست كەوتنی خۆراكیان. شیكەرەوەكان یارمەتی پاكژكردنەوەی شوێنەوار دەدەن. كەڕوو وكرمی زەوی و بەكتریا لە جۆری شیكەرەوەكانن.

✔ **شیكەرەوەكان چیین ؟**



زۆربەی بەكتریاكان شیكەرەوەن ◄



قارچكی گەشە كردووی سەرقەدی ئەم درەختە لە شیكەرەوەكانە. كە ڕوو قەدی ڕووەك بەكاردەهێنێت وەك خۆراك.▼

## پوختە

ڕووەك و گیانەوەران كارلێك دەكەن هەریەكەیان پشت بە ژینگەكەیان و پشت بەیەكتر دەبەستن بۆ ئەوەی خۆراكی پێویستیان دەستكەوێت. ڕووەكەكان بەرهەمهێنن، گیانەوەرانیش بەكارهێنن، شیكەرەوەكان خۆراكیان لێك هەڵوەشانی پاشەڕۆ و ماددە مردووەكان بەدەست دەكەوێت.

## پێداچوونەوە

١. چۆن بەرهەمهێنەكان خۆراكیان دەست دەكەوێت؟

٢. چۆن بەكارهێنەكان خۆراكیان دەست دەكەوێت؟

٣. هەرسێ كۆمەڵە بەكارهێنەكە بژمێرە.

٤. چۆن شیكەرەوەكان یارمەتی ژینگە دەدەن بە پاكژی بمێنێت.

٥. **ئامادەكاری بۆتاقیكردنەوە** كام لەم زیندەوەرانەی خوارەوە بەكارهێن نین.

أ بالندە

ب درەخت

ج سمۆرە

د مەڕ



## بەستنەوەكان



بەستنەوە بە بیركارییەوە

**شیكاری پرسیارەكە :**

هەندێك لە زاناكان لێكۆڵینەوەیان دەربارەی (٩) ئاسك كرد لە دوورگەیەكدا بۆیان دەركەوت كە هەر ئاسكێك لە هاویندا (٢٥)دەوەنی تووی ڕەش دەخوات پێویستە ژمارەی دەوەنی تووی ڕەش لەم دوورگەیەدا بەلایەنی كەمەوە چەندبێت.



بەستنەوە بە تەندروستی

**ددانەكان**

بیر بكەوە لە وەی كە چۆن ددانەكانت لە كاتی خۆراك خواردندا بە كار دەهێنیت كامیان بۆ برین وكامیان بۆهاڕین بەكار دەهێنیت ؟ئایا لە چیدا جیاوازن؟

وانەی ٢

# زنجیرەی خۆراك چییە؟

لەم وانەیەدا لە وانەیە . . .



**لێدەکۆڵیەوە**
لە نموونەی زنجیرەی خۆراك



**فێردەبی**
لە زنجیرەی خۆراك و قوچ... وزە



**زانست دەبەستی**
بە بیرکاری و هونەرە جوانەکان.



## لێدەکۆڵمەوە

## نموونەیەکی زنجیرەی خۆراك دروستبکە

**ئامانجی چالاکییەکە** تۆ وزەت لەو خۆراکەوە بەدەست دەکەوێت کە دەیخۆیت هەموو زیندەوەران وزەیان لەو خۆراکەوە بەدەست دەکەوێت کە دەیخۆن لەم چالاکییەدا نموونەیەك دروست دەکەیت بۆ دەرخستنی ئەوەی کە چۆن زیندەوەران کارلێك دەکەن بۆ ئەوەی وزەیان لەخۆراکەوە بەدەست بکەوێت.

### کەرەستەکان

- کارتی پێڕست
- ٤ دەزوو
- پێنووسی هێڵکاری
- شریتی لکێن

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. ژمارە بۆکارتی پێڕست دادەنێین لە گۆشەی خوارەوە لای ڕاست لە (١– ٥)

٢. وێنەی گژوگیا لەسەر کارتی (١) دروست بکە لە سەری بنووسە گژوگیا. وێنەی سیسرکی شەو لەسەر کارتی ژمارە (٢) بکێشە، ناوەکەی بنووسە، لەسەر کارتی ژمارە (٣) وێنەی بۆقێك بکێشەو ناوەکەی بنووسە، لەسەر کارتی ژمارە (٤) وێنەی مارێك بکێشە و ناوەکەی بنووسە ، لەسەر کارتی ژمارە (٥) وێنەی بازێك بکێشەو ناوەکەی بنووسە. (وێنەی أ )



پوفین (Puffin)
ئەم باڵندە دەریاییە چەند جۆرێك لە گیانەوەرانی دەریا دەخوات دەتوانێت بەهۆی دەنووکییەوە دە ماسی بچووك بەجارێك بەدەنووکی بگرێت.



وێنەی ا



وێنەی ب

٣ کارتەکان لەسەر یەك هێڵ ڕێکبخە بە مەرجێك کارتی ژمارە(١) یەکەم دانەبێ و کارتی ژمارە (٥) دووا دانە بێت . دەزووەکان و شریتی لکێن بۆبەیەك گەیاندنی کارتەکان بەکاربهێنە (وێنەی ب)

٤ کارتەکان لەسەر مێزێك بڵاوبکەوە بۆئەوەی نموونەی زنجیرەیەکی خۆراك بنوێنێت .

٥ لەگەڵ هەڤاڵەکانت گفتو گۆ بکە لەسەر ئەوەی کە چۆن زیندەوەران لە زنجیرەی خۆراکدا خۆراکیان دەست دەکەوێت . لە نموونەکەدا ئەوزیندەوەرانە دیاری بکە کە بەرهەمهێنن . پاشان ئەوزیندەوەرانە دیاری بکە کەبەکار هێنن .

## دەرئەنجام

١. کام جۆر لە زیندەوەرانی ناو نموونەکە دووا دانەیە لە زنجیرە خۆراکییەکەدا ؟ بە ڕای تۆ بۆچی لەو شوێنەدا دانراوە لە زنجیرە خۆراکییەکەدا؟

٢. لە کام بەشی زنجیرەکەدا بەرهەمهێن دادەنرێت ؟ بەڕای تۆ بۆچی لەو شوێنەدا دانراوە لە زنجیرە خۆراکییەکەدا ؟

٣. **چۆن زاناکان کاردەکەن** زاناکان نموونە بەکار دەهێنن بۆ لێکۆڵینەوەی ئەوشتانەی لە سروشتدا هەن ، چۆن بەکار هێنانی نموونەی زنجیرەی خۆراکی یارمەتیت دەدات بۆ تێگەیشتنی زیندەوەران و ئەو خۆراکەی کە دەیخۆن؟

زانست | کردەییەکانی | کارامەییە

ئاستەنگەکە بتوانێت تێبینی زنجیرەیەکی خۆراکی ڕاستەقینە بکەیت بەکارهێنانی نموونەی زنجیرەی خۆراك یارمەتیت دەدات بۆ فێربوونی زنجیرەی خۆراکی ڕاستەقینە.



## فێردەبم

# خۆراك و وزە

## زنجیرە خۆراکییەکان

هەموو زیندەوەران پێویستییان بە وزە هەیە بۆ ئەوەی بژین بەرهەمهێنەکان وزەی پێویستییان لە تیشکی خۆرەوە دەست دەکەوێت ئەم وزەیەش لەو خۆراکەیدا کۆدەکەنەوە کە بەرهەمی دەهێنن .
بەکارهێنەرەکان ناتوانن خۆراك بەرهەم بهێنن بەڵکو خۆراکیان لە خواردنی زیندەوەرەکانی دیکەوە دەست دەکەوێت. لە چالاکییەکەی سەرەوەدا بۆت دەردەکەوێت کە ڕێڕەوی خۆراك لە زیندەوەرێکەوە بۆ زیندەوەرێکی **زنجیرەی خۆراك** پێك دەهێنێت. زنجیرەی خۆراك ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن وزە لە ژینگەدا دەگوازرێتەوە بۆ نموونە گیا وزەی تیشکی خۆر بەکار دەهێنیت بۆ دروست کردنی خۆراکەکەی پاشان سیسرکە شەو گەڕەکان ئەو گیایانە دەخۆن بۆ دەستکەوتنی وزە کۆکراوەکەی . ئەگەر بۆقێك ئەو سیسرکە بخوات ئەوا ئەو وزەیەی لەناو لەشی سیسرکەکەدا کۆکراوەتەوە وەردەگرێت.

✔ زنجیرەی خۆراك چییە ؟

**بناسە**

- چۆن زیندەوەران وزەیان دەست دەکەوێت.
- چۆن وزە بەزنجیرەی خۆراکدا دەگوازرێتەوە.

**زاراوەکان**

زنجیرەی خۆراك
قووچەکی وزە



ئەم کیسەڵە ئەو کرمە لیقەیە دەخوات کە لەسەر گەڵای ڕووەکەکە دایە.

ڕووەکە سەوزەکان هەموویان بەرهەمهێنن گەڵاکانیان خۆراک بەرهەم دێنن ڕووەکەکان زیادەی خۆراک کۆدەکەنەوەکە بەرهەمیدێنن، ئەویش وزەی تێدایە.



کرمەلیقە بەکارهێنەرە گەڵا دەخوات گەڵاکان کە کرمەلیقە دەیخوات وزەی کۆکراوەی تێدایە لەو کاتەی کرمەلیقە گەڵا دەخوات وزەی دەست دەکەوێت.



ئەم کیسەڵە بەکارهێنەرە یەکێك لەخۆراکەکانی کرمە لیقە کاتێك کیسەڵ کرمە لیقە دەخوات وزەی لێ وەردەگرێت.



## وزە لە خۆراکدایە

ئەو وزەیەی کە زیندەوەران بەکاری دەهێنن لە ماوەی ژیاندا بە زنجیرەی خۆراک ناگوازرێتەوە.

لە **قووچەکی وزە** دا دەردەکەوێت کە وزەی بەکارهێنراو لە ژینگەیەکدا کەم دەبێتەوە لەو کاتەی کە لە بنکەوە بەرەو سەرەوە بڕۆی.

لە هەر قووچەکی وزە دا ژمارەی بەرهەمهێن زیاترە لەهەموو ژمارەی جۆرەکانی بەکارهێن. زۆربەی ئەو وزەی لە ژینگەدایە لەناو ڕووەکدایە. بەڵام ئەوگیانەوەرانەی ڕووەک خۆرن لە ئاستی دووەمدا دێت، ئاستە بەرزەکانی دیکەی قووچەکی وزە هەموو گیانەوەر خۆرن. تاکو گیانەوەری بەکارهێن لە قووچەکی وزەدا ئاستەکەی بەرز بێت ئەوا ژمارەکەیان کەم دەبێتەوە ئەویش بە هۆی کەمبوونەوەی بڕی وزەی پێویستەوە بۆیان.

✔ قووچەکی وزە چییە؟

١ ڕووەکەکان ئەو وزەیەی کە دەستیان دەکەوێت لە خۆرەوە بۆ گەشەو دروست کردنی بەرو تۆ بەکاری دێنن. ئەو وزەیەی کە بەکاری ناهێنن کۆدەکرێتەوە.

٢ ئەو گیانەوەرانەی کە ڕووەک دەخۆن بەبەکارهێنی یەکەم ناو دەبرێن. گیانەوەران ئەو وزەیەی کە بەکاری ناهێنن لەناو لەشییان کۆدەکەنەوە.

٣ ئەو گیانەوەرانەی کە گیانەوەری دیکە دەخۆن بەبەکارهێنانی دووەمی ناو دەبرێن، بڕێك لە وزەی کۆکراوە لەناو لەشی بەکارهێنی یەکەم دەگوازێتەوە بۆ بەکارهێنی دووەم.

٤ ئەو وزەیەی کە گیانەوەرەکە لە لووتکەی قووچەکەکەدایە دەستیان دەکەوێت لە بەشەکانی دیکەی زنجیرەی خۆراك بۆ یان گواستراوەتەوە.

### تیشکێك لەسەر بابەتەکە

## قووچەی وزە














▲ کەمتیار گیانەوەرێکە گیانەوەری مردوو دەخوات

## پوختە

زیندەوەران وزەیان لە خۆراکەوە دەست دەکەوێت. گیانەوەر ناتوانێت خۆراك بەرهەم بهێنێت لەبەر ئەوە زیندەوەرانی دیکە دەخوات بۆ دەست کەوتنی وزەی پێویست. زنجیرەی خۆراك جووڵەی وزەی کۆکراوەی ناو خۆراکە لە زیندەوەرەکەوە بۆ زیندەوەرێکی دیکە تا بەرەو سەرەوەی قووچەکی وزە بڕۆین (لە بنکی قووچەکەکە دوور بکە وینەوە ) ئەوا بڕی وزەی گەیشتوو بە گیانەوەران کەم دەکات.

## پێداچوونەوە

١. چۆن وزە لە بەرهەمهێنێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ بەکارهێنێکی گۆشتخۆر ؟

٢. ئەو زیندەوەرانە چین کە دەکەونە لوتکەی زنجیرەی خۆراکەوە؟

٣. گەورەترین بڕی وزە دەکەوێتە کوێی قووچەکی وزەوە؟

٤. سەرچاوەی سەرەکی وزە لەسەر زەوی چییە؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** چی لە زنجیرەی خۆراکدا،لە زیندەوەرێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ زیندەوەرێکی تر ؟

أ بەرهەمهێن　　　ج گیانەوەر

ب تیشکی خۆر　　　د وزە



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاریەوە

### بەشەکان بژمێرە

ژمارەی بەشەکانی زنجیرە یەکی خۆراك بژمێرە کە پێکهاتبێت لە بەرهەمهێن و بەکارهێنێك کە ڕووەك بخوات و بەکار هێنێکی تر کە ڕووەك و گیانەوەر بخوات بەکارهێنێك کە تەنها گیانەوەر بخوات کام جۆرە زیندەوەر لە زنجیرە خۆراکییەکەدا ڕووەك دەخوات ؟



بەستنەوە بە هونەرە جوانەکان

### زنجیرەکانی خۆراك

ژمە خۆراکەکان کە دەیخۆیت جۆراوجۆرن لەسەر خواندا. لە وانەیە نان یان برنج یان گۆشتی مریشك یان سەوزە یان گۆشتی بەرخ یان ماسی یان لە ناودا هەبێ. وێنەی سێ زنجیرەی خۆراك بکێشە کە تۆ لە ناویاندا بەشێك بیت.

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

ئەم زاراوانەی خوارەوە بەکاربهێنە بۆ تەواوکردنی ڕستەکان لە (١تا ٩) ژمارەی لاپەڕەکەی تۆمارکراوە لە نێوان ( ) شوێنی بوونی زانیارییەکان لە بەندەکەدا نیشان دەدات کە لەوانەیە پێویستیت پێیان هەبێت.

کار لە یەکتر دەکەن (٦٨)

بەرهەمهێن (٦٩)

بەکارهێن (٦٩)

ڕووەکخۆر (٦٩)

گۆشتخۆر (٧٠)

ڕووەك خۆر و گۆشت خۆر (٧٠)

شیکەرەوە (٧٠)

زنجیرەی خۆراك (٧٤)

قووچەکی وزە (٧٦)

١. ـــــــــــــــ لە سەر پاشماوەی زیندەوەران دەژیت.

٢. ڕێڕەوی گواستنەوەی خۆراك لە ژینگەدا ناو دەبرێت بە ـــــــــــــ.

٣. ـــــــــــــــ خۆراك بۆ خۆیان دروست دەکەن.

٤. ئەو زیندەوەرانەی زیندەوەرانی تر دەخۆن ناودەبرێن بە ـــــــــــــــ.

٥. ئەو بەکارهێنەرانەی کە ڕووەك و گیانەوەران دەخۆن ناو دەبرێن بە ـــــــــــــــ.

٦. زیندەوەران لەگەڵ یەکتردا و لەگەڵ شتە نازیندووەکاندا ـــــــــــــ لە ژینگەکەیاندا.

٧. ئەو بەکارهێنەرانەی کە تەنها ڕووەك دەخوات ناو دەبرێن بە ـــــــــــ.

٨. ئەو نموونەیەی کە ڕێڕەوی وزە لە زنجیرە خۆراکیەکاندا دیاری دەکات پێی دەووترێ ـــــــــــــــ.

٩. ئەو بەکارهێنانەی کە تەنها گیانەوەر دەخوات ناو دەبرێن بە ـــــــــــــــ.

## بەستنەوەی چەمکەکان

ئەو وشانەی لە خوارەوە هاتوون لە جێگەی گونجاوی نەخشەی چەمکەکان دا بنووسە.

| | |
|---|---|
| بەکار هێن | ئەسپ |
| شیکەرەوە | کەڕوو |
| گیا | بەرهەمهێن |



## دڵنیا بوون لە تێگەییشتن

وشەی گونجاو هەڵبژێرە یان بازنەیەك بە دەوریدا بکێشە بۆ ئەم ڕستانەی خوارەوە.

١. کام لەمانەی خوارەوە بەرهەمهێن نین؟
أ درەخت
ب گوڵ
ج گیا
د باڵندە

٢. ئەو نموونەیەی کە گواستنەوەی وزە لە زنجیرەی خۆراك ڕوون دەکاتەوە بریتی یە لە؟
أ شیکەرەوە
ب قووچەکی وزە
ج ژینگە
د بەرهەمهێن

٣. بەرهەم هێنەرەکان چۆن وزەیان دەست دەکەوێ؟
أ لە زیندەوەرانی ترەوە
ب قووچەکی وزە
ج خاك
د خۆر

**وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەرەوە؟**

٤. ڕوونی بکەرەوە چۆن گورگ کە گۆشت خۆرە، پشت بە ڕووەکەکان دەبەستێ.

٥. چ گۆڕانکاریەك لەم زنجیرەی خۆراکە ڕوودەدات ئەگەر بازەکان کەم ببن بە کاریگەری ڕاوکردنی زیاد لەسەر ژمارەی سرووشتی چییە؟

**دانەوێڵە ← مشك ← باز**

## پێداچوونەوەی کارامەییە کردەییەکانی زانست

١. چۆن تێبینی بە کار دەهێنی بۆزانینی ئەوەی کە بەران دەخوات؟ بەڵگەت چییە بۆ ئەو شتەی کە بەران دەیخوات؟

٢. نموونەیەك بە کار بهێنە بۆ وێنە کێشانی زنجیرەی خۆراك کە دانەوێڵە مشك باز، تێدابێت.

## هەڵسەنگاندنی بە جێهێنان

**وێنەی زنجیرەیەکی خۆراك بکێشە:**

لەگەڵ هەڤاڵێکتدا گیانەوەرێکی ماڵی هەڵبژێرە، پاشان وێنەی زنجیرەیەکی خۆراك بکێشە کە ئەو زیندەوەرەی تێدابێت بەرهەمهێنەرو بەکارهێنەر لەو زنجیرەیەدا دیاری بکە.



# چالاکی بۆ ماڵ یان بۆ قوتابخانه

## خوێندنەوەی پەڕ

### کەرەستەکان

- جۆرێك یان زیاتر لە پەڕی باڵندە.
- هاوێنەی گەورەکەری دەستی.



## بەشەکانی پەڕ چیین

### هەنگاوەکان

1. پەڕ بپشکنە هاوێنەی گەورەکەر بەکاربهێنە بۆ تێبینی کردنی بەشەکانی تێبینیەکانت تۆماربکە.
2. دەست لەپەڕ بدە لەوکاتەی کە سەیری دەکەیت. ئەوەی کە هەستی پێ دەکەی تۆماری بکە.

### دەرئەنجام

ئەوەی لەسەر باڵندەکان دەزانی، گفتوگۆی لەسەر بکەوە بیر لەو بکە کە چۆن پەڕ یارمەی فرینی چۆڵەکەکان دەدات

## زنجیرەی خۆراك

### کەرەستەکان

- هێمای ناو بۆ گیانەوەرانی جۆراوجۆر
- پێنووسی هێڵکاری
- توورەکەی نایلۆنی بچووك

### هەنگاوەکان

ئەم یارییە لەگەڵ دە کەس یان زیاتردا بەجێ بهێنە.

1. داوا لە هەر یەکێك بکە کە باجی ناو دابنێ وەك کوللە یان مار یان باز. پێنووسی هێلکاری لەسەر ڕووبەرێکی گەورە بڵاوکەوە، پێنووسی، هێلکاریە لە جیاتی خۆراکە




## گیانەوەران چۆن خۆراکیان دەست دەکەوێت؟

2. هەر سوڕێکی یارییەك ٣٠ چرکە بخاینێت لە سوڕی یەکەم دا تەنها کوللە یاری دەکات کە پێنووسی هێلکاری ئەوەندەی دەتوانێت کۆی دەکاتەوە لە کیسێکی نایلۆن دا دای دەنێ.
3. لەسوڕی دووەمدا تەنها مار یاری دەکات.
4. لەدوا سوڕدا تەنها باز یاری دەکات.

### دەرئەنجام

کام لەم گیانەوەرانەدا بڕی زۆر تر خۆراکی هەیە. دوای تێپەڕ بوونی سێ سوڕ وەڵامەکەت باس بکە.

# یەکەی دووەم زانستەکانی زەوی



## پرۆژەی یەکەکە

### شێوەی گۆماو و بەهەڵم بوون

گەرمی تیشکی خۆر دەبێتە هۆی بەهەڵم بوونی ئاو و گواستنەوەی بۆ هەوا، لەکاتی خوێندنی ئەم بەشە، دەتوانی تاقیکردنەوەیەکی درێژ ئەنجام بدەیت، بۆ ئەوەی بزانیت چۆن شێوەی گۆماو کاریگەرە لەسەر گواستنەوەی ئاو بۆ هەوا.
ئەمەش پرسیارێکە بۆ ئەوەی بیری لێ بکەیتەوە: ئایا بەهەڵم بوونی ئاو لەکام جۆرگۆماو خێراتر دەبێت لە گۆماوی قووڵ یان گۆماوی تەنك؟ پلان بۆ تاقیکردنەوەیەك دابنێ وەجێ بەجێی بکە بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارەو پرسیاری دیکە کە دێنە بیرت لەسەر بەهەڵم بوون.

# بەندی



# خاو و تاوێرەکان

بڕوانە تاوێرەکانی دەوروبەرت، دەبینیت هەندێکیان لەسەر ڕووی زەوین و هەندێکی تریان بۆ خانوو بینای بازرگانی دروستکردن بەکارهێنراون، هەندێ تاوێر بریسکەدارن و هەندێکی تریان پارچەی فرە ڕەنگیان تێدایە

## زاراوەکان

خاو
تاوێر
توێکلی زەوی
پۆشەر
کرۆك
تاوێرە ئاگرینەکان
تاوێرە نیشتەنی
تاوێری گۆڕاو
سووڕی تاوێر

### زانیارییەکی خێرا



ئەگەر هەورە بروسکە لە کەناریێکی لم بدات، ڕەنگە جۆرە تاوێرێکی نوێ پەیدا ببێ، چونکە ئەو گەرمییەی لە هەورە بروسکەکە پەیدا دەبێت، دەبێتە هۆی تواندنەوەی لمەکەو گۆڕینی بۆ تاوێرێکی شوشەیی.

## زانیارییەکی خێرا

ڕەنگە گڕ تاوە گڕکانیەکان هەموو ئەو شتانە لە ناو بەرێت کە دێنە سەر ڕێی، پلەی گەرمیی گڕتاوە گڕکانییەکان دەگاتە چەند؟ ڕەنگی ئەو گڕتاوە گڕکانییەکانە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە و هەرچەند ڕەنگی گڕتاوەکە ڕووناکتر بێت، گەرمتر دەبێ.



### پلەی گەرمی گڕتاوە گڕکانییەکان

| ڕەنگ | پلەی گەرمی |
|---|---|
| سپی زەردباو | ١٢٥٠ |
| پرتەقاڵی | ١٠٧٥ |
| سووری کاڵ | ٩٠٠ |
| سووری تێر | ٧٢٥ |
| سووری قاوەییباو | ٥٧٥ |

وانەی 

# خاوەکان و تاوێرەکان چیین؟

لەم وانەیەدا . . .

 لێدەکۆڵینەوە
لە پتەوی خاوەکان

 فێردەبی
مرۆڤ چۆن خاو و تاوێر و چینەکانی زەوی

 زانست دەبەستیت
بە بیرکارییەوە و لێکۆڵینەوە کۆمەلایتیەکان.

 لێدەکۆڵمەوە

## پشکنینی خاوەکان

**ئامانج لە چالاکییەکان** چۆن زاناکان خاوەکان لە یەکتری جیادەکەنەوە؟ زاناکان خاوەکان دەپشکنن بۆ زانینی ڕەوشەکانیان. شتەکان بەزانینی ڕەوشەکانیان دەناسین. لەم چالاکییەدا حەوت جۆر لە خاو بپشکنە، لە ڕووی پتەوی چەندیان بەرگری ڕووشاندن دەکەن پاشان خاوەکان بە پێی کەم پتەوی بۆ زۆر پتەویان ڕیزیان بکە.

### کەرەستەکان

- کۆمەڵە خاوێك لە (أ) تاوەکو (ز)، ناسێنراون.

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. ئەو خاوانەی کە زۆر پتەون، خاوە کەم پتەوەکان دەڕووشێنن. هەوڵ بدە بە هۆی خاوەکانەوە (أ) هەموو خاوەکانی دیکە بڕووشێنیت لە خشتەکەدا ئەو خاوانە بنووسە کە بە خاوی (أ) ڕووشێندراون.

٢. ئەو خاوەی پتەوی کەمە بە خاوێکی پتەوتر دەڕووشێنرێت، هەوڵ بدە خاوی (أ) بە هۆی خاوەکانی ترەوە بڕووشێنیت لەخشتەکەدا ئەو خاوانە بنووسە کە خاوی (أ) دەڕووشێنێت.



گوێزە بەردین(جیود)، تاوێرێکی خڕی کلۆرە بلووری خاوی تێدایە.

| خاوی ئامادە کراو بۆ پشکنین | ئەو خاوانەی دەیڕووشێنن | ئەو خاوانەی دەیڕووشێنێت |
| --- | --- | --- |
| أ | | |
| ب | | |
| ج | | |
| د | | |
| ه | | |
| و | | |
| ز | | |

٣ هەنگاوی ١ و ٢ لەگەڵ هەر خاوێك دووبارە بکەوە

٤ بە پێی ئەو زانیارییانەی لە خشتەکەدا هەن، خاوەکان، لە کەمتر پتەوەیەوە بۆ زۆر ترینیان ڕیز بکە و هەر خاوێك ڕەنووسێکی بدەرێ، (١) بدە بە خاوە کەم پتەوەکان.



وێنەی أ

## دەرئەنجام

١. کام خاو پتەوترینیانە؟ کامیان کەم پتەوە چۆن زانیت؟

٢. چۆن گەیشتیتە ئەوەی بەوشێوەیە خاوەکان بە ڕیز ڕێکبخەیت؟

٣. **چۆن زاناکان کار دەکەن** زاناکان بە گشتی هەوڵی ئەوە دەدەن کە شتەکان بە زنجیرە ڕیز بکەن ، چۆن ڕیز کردنی خاوەکان بە پێی پتەویان یارمەتی دایت بۆ ئەوەی ئەو خاوانە بناسیتەوە؟

**کارامەیی کردەکانی زانست**

لەکاتی پشکنین بە روشاندن ئەنجامەکان تێبینی دەکەیت، و تۆماریان دەکەیت لەخشتەیەکدا. لە دوایدا زانیاریەکان کە لە خشتەکەدا هاتوون بەکاریان دێنی بۆ ڕێخستنی شتەکان بە زنجیرە.



## فێردەبم

# خاو و تاوێرەکان

### خاو چییە؟

**بناسە**

- خاو چییە و چۆن بەکاردەهێنرێت؟
- تاوێر چییە؟
- چی لە ژێر ڕووی زەویدا هەیە؟

**زاراوەکان**

خاو
تاوێر
توێکڵی زەوی
پۆشەر «کەوڵ»
کرۆك

ئەگەر تەنێك ڕەق بوو وە لە سروشتدا دروست بووبێت و نازیندووبێت ئەوا **خاوە** چەند جۆرێك خاو هەیە، بەڵام دوو جۆر خاو نییە کە بە تەواوی لە یەك بچن. زێر درەوشاوەیە، خوێی چێشت ڕەنگی کاڵە، ئەڵماس ئەوەندە سەختە کە پۆڵا دەبڕێت. تەباشیر کەم پتەوە و بۆ نووسین بە کاردێت.

✔ سێ جیاکەرەوەی خاوەکان بژمێرە.




▲ مایکا بەکار دێت لە دروستکردنی پێداویستیەکانی جوانکاری و هەوێری ددان.




▲گارنێت یەکێکە لە کۆنە بەردە گران بەهاکان.

▼یەکێك لە شێوەکانی کوارتزی پەمەیی کە بەکاردێت لەپیشەسازی دروستکردنی خشل. میسریەکۆنەکان وا باوەریان وابوو ئەو کەسەی کە ئەم خاوەی هەڵگرتبێ لە مەترسییەکان. دەپارێزرێت.




کوارتز بەکاردێت لە پیشەسازی دروست کردنی شوشە، کوارتز خاوی بنچینەییە لە لمی لێوارەکانی دەریا. ▼



## چۆن خاوەکان بەکاردێنی

کاتێك خوێ دەکەیتە چێشتەوە، تۆ خاو بەکاردەهێنی، یان کاتێك بەقەڵەمی ڕەش دەنووسیت نووکی قەڵەمەکە خاوی گرافیتە.

خاوەکان لەزۆر شتدا هەن کە لە دەوروبەرتدان، ئاسن بەکاردێت لە دروست کردنی پردو بیناسازی و ئۆتومبیل. هەروەها خاوەکانی وەك زێڕ و ئەڵماس لەدروست کردنی خشڵدا بەکاردەهێنرێن وە خاوی کوارتز لە دروستکردنی شوشە بەکاردێت.

✔ **سێ ڕێگای بەکارهێنانی خاوەکان بژمێرە.**




▲ فافۆن (ئەلەمنیۆم) لە خاوی بۆکسایت دەردەهێنرێت فافۆن لە دروستکردنی زۆر کەل و پەلدا بە کاردێت وەك قاپ، پەنجەرە، فڕۆکە

▼ خاوی گرافیت بەکاردێت لە دروست کردنی قەلەمی رەش.







▲ جگە لە بەکارهێنانی زێڕ لە دروستکردنی خشل هەروەها بەکارهێنراوە لە کۆندا پارچەدراوی لێ دروستکراوە، لەم وێنەیەی سەرەوەدا پارچە دروای کوردستانی کۆن دیاردەکات.

▼ خوێ چێشت بریتیە لە بلووری بچووك لە خاوی هالیت.



## تاوێر چییە؟

ڕووی زەوی بەگشتی لە تاوێر پێك هاتووە. **تاوێرەکان** لە خاو پێك هاتووە. هەندێکیان لەیەك خاو پێك هاتووە و هەندێکی تر لە چەند خاوێك پێك هاتووە. تاوێری گرانێت لەچەند خاوێك پێکهاتووە، بەرامبەر تاوێری لمی کە پێکهاتووە لە وردیلە بچوکەکانی خاوێك کە کوارتزە.




▲تاوێری گرانیێت لەو خاوانە پێکدێت کە لێرەدا دەردەکەون وەك فلسبار و کوارتز و مایکای ڕەش (بیوتیت) و مایکای سپی (موسکوفیت).

✔ **سێ ڕێگای بەکارهێنانی خاوەکان بژمێرە؟**

## چینەکانی زەوی

ئەگەر لە توانات دابێ هەسارەی زەوی کەرت بکەیت لە ناوەڕاستەوە، سێ چینی جیاواز لە تاوێر دەبینیت لە هەردوو نیوەی دا.

لەسەر ڕووی زەوی چینی دەرەوەی ڕەقە بە **توێکڵی زەوی** ناسراوە. ئەم چینە لەسەری دەژیت و لەتوانات دایە بیبینی. لەژێر توێکڵی زەوی **پۆشەر «کەوڵ»** دێت، ئەویش چینی ناوەڕاستی زەویە، پلەی گەرمی بەرزە دەبێتە هۆی توانەوەی هەندێ تاوێر. لەژێر کەوڵ لە چەقی زەویدا کرۆك دێت، پلەی گەرمە زیاتر لە پلەی گەرمی ناوچەی کەوڵ.





## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە بیرکاری

#### شێوە ئەندازەییەکان

خاوەکان، لە بلووری شێوە ئەندازەیی رێك و پێك، پێکهاتوون،حەوت شێوەی ئەندازەییان هەیە ، زانیاریان لە بارەوە کۆبکەوە و لایەنەکانی لێکچوون و لێکنەچوون لە نێوانیاندا دەربهێنە.



### بەستنەوە بە لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵایەتی

#### ئامادەکردنی لیستێك بە خاوەکان

لەو خاوانەی کە لەهەرێمی کوردستان دا هەیە بکۆڵەوە پەنا ببەبەر کتێبەکانی ناو پەرتوك خانەی ناو قوتابخانە یان تۆری ئەنتەرنێت وە.


تاوێر و کانزای جۆراوجۆر لە هەرێمی کوردستان







▲ تاوێری لمی لە دەنکۆڵەی وردی کانزای کوارتز پێك دێت.

## پوختە

خاوەکان ماددەیەکی رەقی نازیندوون و لە سروشتدا پێك دێت. تاوێر، لە خاوێك یان چەند خاوێك پێك دێت وە خاوەکان بەکارهێنانی جۆراوجۆری هەیە. زەوی لە سێ چین پێك هاتووە.

## پێداچوونەوە

١. خاو چییە؟

٢. تاوێر چییە ؟

٣. وەسفی چینەکانی زەوی بکە

٤. بەچی پۆشەر لەتوێکڵی زەوی جیادەکرێتەوە.

## بیرۆکەی رەخنەگر

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** کام لەم خاوانە سەختترە؟

أ کوارتز

ب ئەڵماس

ج گرانیت

د گۆگرد

## وانەی ٢

# چۆن تاوێر دروست دەبێت؟

لەم وانەیەدا



لێدەکولیەوە لە
جۆرە جیاوازەکانی تاوێر



فێر دەبی
چۆن تاوێر دروست دەبێت؟ و
چۆن بەکاردەهێنرێت



زانست دەبەستێن
بە بیرکارییەوە. نووسین



## لێدەکۆڵمەوە

# جۆرەکانی تاوێر

**ئامانجی چالاکییەکە** لەم چالاکییەدا، شەش تاوێر جیاواز دەبینیت و ڕەوشەکانیان بەراورد دەکەیت، پاشان، بەوەی دیووتە، تاوێرەکان پۆلێنبکە بۆ چەند کۆمەڵێك.

### کەرەستەکان

- سێ تاوێری کە بە پیتی (ن ، ئا ، گ) دیاری کراون
- هاوێنەیەکی گەورەکەری دەستی
- سێ تاوێری نەناسراو کە بە ڕەنووسی ١، ٢، ٣ ڕەنووسکراون.

### هەنگاوەکانی چالاکییەکان

١. تاوێری ن ، ئا ، گ سێ جۆری جیاوازی تاوێرن. بە هاوێنەی گەورەکەر سەیری تاوێرەکان بکە، پاشان چی دەبینی تۆماری بکە لەم خشتەدا.



پێش هەزاران ساڵ مرۆڤ قەڵا و تەلار و شتی تر لە تاوێر دروست کردووە. لەوانەش قەڵای دێرینی خانزاد لە ناوچەی هەریر لە سۆران.

| تاوێرە کان | ئەوەی دەیبینم |
|---|---|
| ن | |
| ه | |
| گ | |
| ١ | |
| ٢ | |
| ٣ | |


وێنەی أ

٢ سەیری تاوێری بە ڕەنووس (١، ٢، ٣) نیشانکراوەکان بکە، بە بەکارهێنانی هاوێنەیەکی گەورە کردنی دەستی. پاشان بە چاو سەیری بکە بەبێ ئەوەی هاوێنە بە کار بێنی. ئەوەی تێبینیت کرد لە خشتەکەدا تۆماری بکە (وێنەی أ).

٣ بەراوردی جیاکەرەوەکانی تاوێری بە پیت نیشانە کراوەکان و تاوێرە بە ڕەنووس نیشانکراوەکان بکە. پاشان بیربکەوە لە لێك چوون و جیاوازی لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵە تاوێردا.

## دەرئەنجام بکە

**١. ئەو ڕەوشتانە چین کە بەکاری دێنی بۆ بەراوردکردنی تاوێرەکان؟**

٢. ڕەنووسی ئەو تاوێرە نیشانکراوە چییە کە لەو تاوێرە دەچێت کە بە پیتی (ن) نیشانە کراوە ؟ ڕەنووسی ئەو تاوێرە نیشانکراوە چییە کە زیاتر لەو تاوێرە دەچێت کە بە پیتی (گ) نیشان کراوە ؟ وەڵامەکەت باس بکە

٣. چۆن زاناکان کاردەکەن زاناکان لەبەراوردکردنی تەنە نوێییەکان بەو تەنانەی لەمەوپێش لێکۆڵینەوەیان بۆ کردووە فێردەبن. چی لە بەراوردکردنی تاوێرەکانەوە فێربوویت؟

کارامەیی کردەکانی زانست

کاتێك بەراوردی نێوان تەنەکان دەکەیت تێبینی ڕەوشەکانیان دەکەی بۆ ئەوەی بزانی تا چەند لێك دەچن و لێك تر جیاوازن . بەراوردی شتەکان، یارمەتیت دەدات لە پۆلێنکردنیاندا بە شێوەی کۆمەڵە.



## فێردەبم

# چۆن تاوێر پەیدادەبێت؟

بناسە

- چۆن تاوێر پەیدا دەبێت
- ڕێگای بەکارهێنانی تاوێر لە لایەن مرۆڤەوە لە پیشەسازیدا

**زاراوەکان**

تاوێری ئاگرین
تاوێری نیشتەنی
تاوێری گۆڕاو
سووڕی تاوێر

### سێ جۆر لە تاوێر

تاوێرەکانی زەوی بەیەك ڕێگا دروست نەبوون ، بەڵکو بە سێ ڕێگا، وە لەسەر ئەم بنەمایەدا بۆ سێ کۆمەڵ پۆلین دەکرێن بەپێی ڕێگای دروست بوونیان.

**تاوێری ئاگرینی** ئەو تاوێرانە بەشێوەی تواوەبوون و پاش ساردبوونەوەیان بون بە تاوێرێکی ڕەق.

**تاوێری نیشتەنی** ئەو تاوێرانە لە ئەنجامی کەلەکە بوونی پارچەی ورد و خۆڵ و گیانەوەر و ڕووەکی مردوو بە تێپەربوونی کات بوونەتە ماددەیەکی ڕەق.

**تاوێری گۆڕاو** ئەو تاوێرانەن کە ڕووبەڕووی پلەی گەرمی زۆر و پەستانی بڵند بووینە و گۆڕاون بۆ تاوێری نوێ.

✔ **چۆن جیاوازی دەکرێت لە نێوان تاوێری گۆڕاو و تاوێری نیشتەنی؟**



تاوێرە ئاگرینەکان

بازلت

پەیدا دەبێت لە ئەنجامی ساردبوونی تاوێرە تواوەکان.

گرانیت

پەیدا دەبێت لەکاتی ساردبوونەوەی تاوێرە تواوەکان بەهێواش.

تاوێرە ئاگرینەکان لەو ماددە شلەوەبووانە پێکهاتوون ، کە ساردبوونەتەوە وسەخت بوون. هەندێ تاوێری ئاگرین لە گرکانەکانەوە پەیدادەبن.

ناین
ئەمە پەیدا دەبێ لە ئەنجامی بەرکەوتنی تاوێری قوڕی بەپەستان و پلەی گەرمی زۆر بەرز.

تاوێرە گۆڕاوەکان.

مەرمەر
لە ئەنجامی بەرکەوتنی تاوێری کلسی بەر پلەی گەرمی و پەستانی بەرز پەیدا دەبێت.

تاوێری نیشتەنی

تاوێری قوڕینی
پەیدا دەبێت لە دەنکۆڵەی زۆر ورد لە قوڕی گلێنە سازی

تاوێری کلسی
ئەم تاوێرە پەیدا دەبێ لە دەنکۆڵەکانی خاوی کالسیت

## سوڕی تاوێر

فێربووم کە سێ جۆر لە تاوێر هەیە، بریتین لە تاوێری ئاگرینی و تاوێری نیشتەنی و تاوێری گۆڕاو. بەڵام دەزانی کە تاوێرەکان لەوانەیە بگۆڕێن لە جۆرێك بۆ جۆرێکی دیکە؟ کرداری گۆڕینی تاوێرەکان بە **سوری تاوێر** ناسراوە.

✔ **سوری تاوێر چییە؟**

پلەی گەرمی و پەستان
ئەگەر تاوێری ئاگرین و نیشتەنی تووشی پلەی گەرمی و پەستانی بەرزبن دەگۆڕێت بۆ جۆرێکی نوێ لە تاوێر، کە تاوێری گۆڕاوە.

باو ئاو
دەبنە هۆی پەرت بوونی تاوێرەکانی ئاگرینی و گۆڕاو بۆ پارچەی ورد. ئەم پارچانە لە نزماییەکان دەنیشێتەوە و کەڵەکە دەبن. بە تێپەربوونی کات دەبنە تاوێری نیشتەنی.



ئەم تیر ئاسایانە لەم هێلکاریە دا نیشانی دەدەن گۆڕانی هەرجۆرێك لە تاوێر بۆ هەردوو جۆری دیکە.

تووانەوە
ئەگەر تاوێرەکانی نیشتەنی و گۆڕاو تووشی پلەی گەرمی بەرزبین لە ناخی زەویدا ئەوا دەتوێنەوە. وە لەوکاتی دەرچوونی ئەو ماددە تواوانە بۆ سەر رووی زەوی سارد دەبن و دەبنە تاوێری ئاگرینی.

# تاوێر لە هەرێمی کوردستان

## تاوێری نیشتەنی

تاوێرە نیشتەنییەکان زۆربەی زۆری خاکی هەرێمی کوردستان دادەپۆشن. گرنگترین تاوێرە نیشتەنییەکان لە هەرێمدا:

- **تاوێری کلسی**

باوترین جۆرە تاوێرە و زۆربڵاوە.

کارگەیەکی چیمەنتۆ لە نزیک شاری سلێمانی تاوێری کلسی بەکاردەهێنێت بۆ دروستکردنی چیمەنتۆ

تۆندی و ڕەقی تاوێرەکان یارمەتی مانەوەی نەخش و نیگاری خەنەسی داوە تا ئەم ڕۆژە.

- **تاوێری قوڕی**

بە ریزبەندی دووەم دێن، لەڕووی بڵاوبوونیان لە دوای تاوێرە کلسییەکانەوە.

نەخشەیەکی جیۆلۆجی شوێنەکانی بوونی تاوێرەکان لە کوردستاندا نمایش دەکات.

تاوێری قوڕی

تاوێری قوڕی «کەرپوچ» بەکارهێنراون لە دروستکردن دا (منارەی چۆلی)

## تاوێری لمی

بەریزبەندی سێیەم دێت لەڕووی بڵاوبوونەوەی دوای تاوێری قوڕی.

وە تاوێری نیشتەنی دیکە هەیە وەك تاوێری (ڕەسیس و تەفل).



تاوێری لمی

# تاوێری ئاگرینی و گۆڕاو

تاوێری ئاگرینی و گۆڕاو لەنزیك ناوچەکانی سنووری هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئێران و تورکیا دا هەن.



تاوێری گرانێتی ئاگرینی لە ناوچەی ماوەت دیارن.



بەکارهێنانی تاوێری گۆڕاو لەشاری سلێمانی



کانی بەردی مەڕمەڕی گۆڕاو لەشاری سلێمانی.



تاوێری بازلتی ئاگرینی لە نزیك پێنجوین.



ئەم کاشییە لە هەرێمی کوردستان دروستکراوە. پارچەی بچووك لە تاوێری گۆڕاوی تێدایە (سەوز و سپی) وە تاوێری ئاگری (ڕەش)، کە لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی هەرێم دەرهێنراوە.

## چۆن مرۆڤ تاوێر بەکاردێنێت

خشل دروست دەکرێت لە تاوێری سەرنج ڕاکێش و ڕەنگاو ڕەنگ. ڕێگاو بانەکان بەپارچەی بچووك لە تاوێر فەرش دەکرێن پێش قیرتاوکردن. دروست کردنی خانوو بەرە بە پارچەی وەرگیراو لە تاوێرەکانەوە وە هەروەها شووشە لە تاوێری لمی دروست دەکرێ.

✔ دوو بەکارهێنانی تاوێر بڵێ.



▲ خانوویێك لە تاوێر دروست کراو لە گوندی (سەرگەڵو) لە سلێمانی



▲ فەرش کردنی ڕێگاوبانەکان بە چەو.



▲ تاوێرکان بەکاردێن بۆ ڕازاندنەوە، ئەم مۆزاییکە بریتیە لە تاوێری بچووك بەشێوەیەکی هونەری لەگەڵ یەکتری ریزکراون بۆ ڕازاندنەوەی منارەی ئەم مزگەوتە لە شاری هەولێر.

## پوخته

سێ جۆر تاوێر هەیە، **لە مانەش** تاوێری ئاگرین و تاوێری نیشتەنی و تاوێری گۆڕاون. ئاگرە تاوێرەکان لە تاوێرە تواوەکانەوە دروست دەبن، دوای سارد بوونەوە و پتەو بوونیان. نیشتە تاوێر لە چەند چینەك لە مادده نیشتووەکان پێك دێت، تاوێری گۆڕاویش بە هۆی گەرمی و پەستانەوە دروست دەبن .سوڕی تاوێر دەیسەلمێنی کە چۆن لە جۆرێکەوە دەگوڕێن بۆ جۆرێکی دیکە.

## پێداچوونەوە

١. چۆن تاوێری ئاگرین دروست دەبن ؟

٢. چۆن تاوێری ئاگرین دەگوڕێت بۆ تاوێری نیشتەنی؟

٣. چۆن تاوێر گۆڕاو دەگۆڕێت بۆ تاوێری ئاگرینی؟

٤. جۆرێك لە تاوێر هەڵبژێرە و گرنگترین بەکارهێنانەکانی بلێ.

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** کام جۆرە تاوێر لە چەند چینێك پێك هاتووە.

أ تاوێری ئاگرین

ب تاوێری گۆڕاو

ج تاوێری نیشتەنی

د هەموو جۆرەکانی تاوێر



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### شیکاری پرسیارێك

وای دابنێ کە داوات لێ کراوە نموونەیەکی سووڕی تاوێر ئامادە بکەیت، لەو نموونەیەدا کە ئامادەی دەکەی سێ جۆر لە هەر جۆرە تاوێرێك هەبێت. چەند تاوێر لەم نموونەیدا دەبێ؟



بەستنەوە بە نووسین

### راپۆرت

چاوپێکەوتنێك بکە لەگەڵ کەسێکی کە لە خاو و تاوێرەکان کاردەکات. لێی بزانە چۆن تاوێر بەکاردەهێنرێت راپۆرتێك بۆ مامۆستایەکەت بنووسە لەوەی کە فێری بویت، لەگەڵ هاورێکانت بدوێ لەسەر نووسینەکەت.

# بەندی ١ پێداچوونەوە و ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

ئەم وشانەی خوارەوە بەکار بێنە بۆ تەواو کردنی ڕستەکانی لە (١بۆ٩) ژمارەی لاپەڕەکانی کە لە نێوان () نووسراوە. شوێنی زانیاریەکانت بۆ دیاری دەکات کە لەوانەیە پێویستی پێی بێت لە بەندەکاندایە.

**خاو (٨٨)**

**تاوێر (٩٠)**

**توێکڵی زەوی (٩٠)**

**کەوڵ (٩٠)**

**کرۆک (٩٠)**

**تاوێری ئاگری (٩٤)**

**تاوێری نیشتەنی (٩٤)**

**تاوێری گۆڕاو (٩٤)**

**سوڕی تاوێر(٩٥)**

١. ئەو تاوێرانەی کە بە کاریگەری گەرمی و پەستان لە ناو زەویدا دەگۆڕێت بریتین لە ________.

٢. ________ ئەو چینە زۆر گەرمەیە کە دەکەوێتە ژێر چینی پۆشەر «کەوڵ».

٣. ئەو ماددە ڕەقانەی کە لە خاوەوە پەیدا دەبێت بریتیە لە ________.

٤. ________ ماددەیەکی سروشتی ڕەقە لە سروشتدا پەیدابووە و زیندوەر نەبووە.

٥. ئەو تاوێرانەی کە لە وردیلەکانی تاوێر و خۆڵ و گیانەوەران و ڕووەکی مردوو پەیدا دەبن، بریتین لە ________.

٦. ________ چینی ناوەراستی زەوییە کە پلەی گەرمی تاوێرەکانی بەرزە.

٧. بە کردەی گۆڕینی تاوێر لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دیکە دەووترێ ________.

٨. ________ بریتیە لە چینی دەرەوەی زەوی.

٩. ئەو تاوێرانەی کە تواونەتەوەو پاشان پتەوبووینە بریتیە لە ________.

## پێکەوە بەستنی چەمکەکان

ئەو وشە و ڕستانەی خوارەوە ،لە شوێنی گونجاوی نەخشەی چەمکەکانی دابنێ.

| | |
|---|---|
| خاو | نیشتوو |
| ئاگرین | گۆڕاو |

**تاوێر تووشی پلەی گەرمی بەرز و پەستان بووینە.**
**وردیلەی تاوێر و خۆڵ و گیانەوەر و ڕووەکی مردوون.**
**تاوێری تواوەن لە دوایدا سارد بوونەتەوە و بویتە پتەو.**

تاوێر

١. تاوێرەکان پێک هاتوون لە ________ .

تاوێرەکان سێ جۆریان هەیە

٢. ________ ٣. ________ ٤. ________

٥. پێک دێت لە ________

٦. پێک دێت لە ________

٧. پێک دێت لە ________

## دڵنیا بوون لە تێگەیشتن

پیتی گونجاو بۆ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

١. تاوێر لە ________ پێك هاتووە.

أ تەنها لە پاشماوەی ڕووەك و گیانەوەری مردوو.
ب یەك خاو یان چەند خاوێك
ج تەنها خاوی ئاگری
د خاوی سەخت

٢. گەرمی یارمەتی دروستبوونی ________ دەدات.

أ تاوێری ئاگری و تاوێری گۆڕاو.
ب تاوێری نیشتەنی و تاوێری گۆڕاو.
ج تەنها تاوێری ئاگری.
د تەنها تاوێری گۆڕاو.

وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەرەوە:

٣. گرنگترین جیاکەرەوەکانی زێر و ئەلماس چیین؟

٤. نموونەیەك لە تاوێرێکی ئاگرینی بەدەست کەوت وە ویستت بزانی ئایا ئەم تاوێرە بازلتە یان گرانێتە؟ چۆن بە یارمەتی ڕەنگەکەیان جیایان دەکەیتەوە.

## پێداچوونەوەی کارامەییە کردەییەکانی زانست

١. بەراوردبکە لە نێوان پێکهاتەی گرانێت و تاوێری لمی.

٢. ئەگەر ئارەزووت کرد سێ تاوێری نەناسراو لەگەڵ سێ تاوێری ناسراودا بەراورد بکەیت، پشت بە چ تایبەتمەندییەك دەبەستی لەم بەراوردکردنە ؟

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

### گۆڕانی تاوێر

جۆرە تاوێرێك هەڵبژێرە و باسی بکە کە چۆن ئەو جۆرە تاوێرە لە سوڕی تاوێردا دەگۆڕێت بۆ کەڤری تر. وێنەیەك بکێشە هەنگاوەکانی گۆڕانی کەڤرەکەی تێدا نیشان بدە .



# بەندی ٢

# ئاو

ئاوێکی زۆر لەسەر هەسارەی زەوی هەیە. زەوی لە ڕاستیدا زۆربەی بە ئاو داپۆشراوە. زۆربەی ئاوی زەوی بەستەڵەکە یان سوێراوە. لەگەڵ ئەوەی ئاو وا دەردەکەوێت کە لە هەموو شوێنێکدا هەیە کەچی هەندێ شوێنی تریش بە تەواوی بێ ئاوە.

## زاراوەکان

ئاوی ژێر زەوی
سوڕی ئاو
بەهەڵمبوون
چڕ بوونەوە
دابارین

### زانیارییەکی خێرا

ئەو بەلووعەیەی شێرەکەی ئاوی لێ دەچێ، لە ڕۆژێکدا نزیکەی ٧٦ لیتر ئاو بە فیرۆ دەدات. جا ئەگەر یەك ڕۆژ چاوەڕێت کرد و شێرەکەت بۆ وەستاندنی لێچوونەکە چاك نەکرد، ئەوا ١٠٠٠٠٠ دڵۆپە ئاوی لێ دەچێت! ئاو یەکێکە لە بەخششەکانی خوا بۆ ئێمە، دەبێ بیپارێزین.

## زانیارییەکی خێرا



هەموو کەسێك لە هەرێمی کوردستان لە ڕۆژێکدا ٤٥٠ لیتر ئاو بەکاردەهێنێت، بەڵام لە ئەمریکا بڕی ٣٥٠ لتر ئاو هەر کەسێك بەکاردێنێت. ئەم نەخشەیەی خوارەوە بەکارهێنانی ئاو لە ئەمریکا دیاردەکات.

| بڕی ئاوی بەکارهێنراو | |
|---|---|
| چالاکی | لیتر |
| پاککردنەوەی ددان و نەگرتنەوەی شێرەی ئاو | ٢٣ |
| بەکارهێنانی قاپشۆری کارەبا | ٤٥ |
| خۆششتن | ٩٥ |
| جلشۆرێك پڕ لە جل و بەرگ بۆ یەکجار | ١٩٠ |

## زانیارییەکی خێرا



بڕە خۆراکێك بۆ هەشت کەس، لە ڕووەك و گیانەوەران ئامادەبکرێت، ١٥٩٠٠٠ لیتر ئاو بەکاردەهێنرێت. ئەگەر ئەو بڕە ئاوە کە ئەو گیانەوەر و ڕووەکانە لە سەرەتای دروست بوونیانەوە بەکاریانهێناوە، حەوزێکی مەلەوانی پڕ دەکاتەوە.

وانەی ١



# ئاو لەکوێی سەر زەویدا هەیە؟

لەم وانەیەدا . . .



**لێدەکۆڵیتەوە**
دەربارەی بڕی ئەو ئاوەی ڕووی زەوی داپۆشیوە



**فێردەبیت**
دەربارەی ئاو لەسەر زەویدا



**زانستەکان دەبەستیتەوە**
بە بیرکاری و هونەرە جوانەکان.





## لێدەکۆڵمەوە

# وشکانی یان ئاو

**ئامانجی چالاکیەکە** چی زۆربەی ڕووی زەوی دادەپۆشێت؟ وشکانی یان ئاو؟ لەم چالاکییەدا یاریەك دەکەین بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان دەربارەی ڕووی زەوی. ئینجا ژمارە بەکاردەهێنین بۆ دەستنیشان کردنی ئەو ئاوەی لەسەر ڕووی زەوی هەیە.

■ **کەرەستەکان** بەرجەستەیەکی گۆی زەوی لە پلاستیك دروستکراو کە بتوانێت هەوای تێبکرێت.

## هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. چەند گروپێکی پێنج قوتابی دروست بکەو یەکێك لە قوتابییەکان هەڵبژێرە بۆ تۆمارکردنی دەرئەنجامەکان لەسەرکاغەزێکی تایبەت، بەڵام چوار قوتابیەکەی دیکە گۆیەکە دەهاوێژن.

٢. داوا لە چوار قوتابیەکەی تر بکە گۆیەکە بهاوێژن بازنەیەك پێك بهێنن. ئەو قوتابیەی ئەنجامەکان تۆمار دەکات گۆیەکە دەداتە قوتابی یەکەم لە بازنەکەدا ئەویش گۆیەکە بەهێمنی دەهاوێژێت بۆ قوتابییەکی دیکە لە بازنەکەدا. (وێنەی أ)



◄ لە شوێنە ساردەکاندا لەوانەیە ئاو بەشێوەی بەفربێت.

٣ پێویستە ئەو قوتابییەی کە گۆیەکە دەگرێتەوە، هەردوو دەستی کراوەبێت. ئەو قوتابییەی ئەنجامەکان تۆماردەکات، دەبێت ئاگادار بێت لەوەی پەنجەی شایتمانی ئەو قوتابییەی گۆیەکە دەگرێتەوە کەوتۆتە سەر بەشی و شکانی یان بەشی ئاو لە گۆیەکە؟ پاشان دەرئەنجامەکان تۆماردەکات لەسەر وشکانی یان لەسەر ئاوە.

٤ بەردەوام بە لەسەر هاوێشتنی گۆیەکە و تۆمارکردنی ئەنجامەکان تا هاوێشتنی گۆیەکە دەبێتە ٢٠ جار.

٥ هەردوو هەنگاوەکانی ٣-٤ دا دوو جاری تر دووبارە بکەرەوە.



وێنەی ١

کارامەیی | کردەکانی | زانست

کۆکردنەوەی زانیارییەکان بە بەکارهێنانی ژمارەکان، یارمەتیت دەدات لە وەڵام دانەوەی پرسیارەکانتدا. لە ئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەم چالاکییەدا بۆ چەند جارێك ، زانیاری زیاترت دەست دەکەوێت. پاشان دەتوانی ڕوونکردنەوە بۆ زانیارییەکانت بکەی ئەویش بۆ دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارەکەت.

## دەرئەنجام

١. کرداری کۆ کردنەوە ئەنجام بدە. چەند جار سەری پەنجەی شایەتمان(دۆشاومژە)ی قوتابییەکە کە تۆپەکەی وەرگرتۆتەوە بەر ئاو دەکەوێت؟ چەند جاریش دەکەوێتە سەر وشکانی؟

٢. پەنجەکانی قوتابییەکە، زۆرتر کەوتۆتە سەر کام بەشی گۆیەکە، بە ڕای تۆ بۆچی؟

٣. **زاناکان چۆن کار دەکەن** زاناکان ژمارە بەکاردەهێنن بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەکاتی بەکارهێنانی ئەو زانیاریيانەی کۆیان کردۆتەوە کامیان گەورەترە ڕووبەری ئاو لەسەر زەوی یان ڕووبەری وشکانی ؟ ڕووبەری ڕووی زەوی بە ئاو داپۆشراو بخەمڵێنە؟



ئەمە دیمەنێکی زەوییە لە بۆشایی ئاسمانەوە، زانینی ئەو هۆیە ئاسانە کە بۆچی بە زەوی دەڵێن هەسارەی شین.



## فێردەبم

# ئاو لەسەر زەوی

**بناسە**

- گرنگی ئاو
- جۆرەکانی ئاو
- شوێنی بوونی ئاو لەسەر زەوی

**زاراوەکان**

ئاوی ژێر زەوی

## گرنگی ئاو

بەبێ ئاو ژیان لەسەر زەوی نابێت، گیانەوەران و ڕووەك پێویستییان بە ئاوە تا بژین هەروەها مرۆڤ. لەشت پێویستی بە ئاوە، بۆ نموونە دوو لەسەر سێی لەشت ئاوە. ڕۆژانە هەر کەس لە ئێمە پێویستە ٢ لیتر ئاو بخواتەوە تا پارێزگاری دروستی خۆی بکات. ئەو خواردنەی کە دەیخۆیت بڕێکی زۆر ئاوی تێدایە. بۆ نموونە مریشکێك زیاتر لە نیوەی لەشی ئاوە هەروەها سەلکی پەتاتە.

ئاو پێویستە بۆ زەوی بەبێ ئاو ڕووبار و دەریاچەو زەریاکان دروست نابن و باران و بەفر و هەوریش پەیدا نابن.



پیشەسازی بەرێژەی نیوەی ئاوە سازگارەکان بەکاردێنێت بۆ شوشتنی شتەکان و ساردکردنەوەیان و لە دروستکردنی بەرهەمەکاندا.

ئاو بەکار دەهێنرێت لە جوانکاری باخچەو گۆرەپانەکان بە نافورەی ئاو هەروەك گۆرەپانی گشتی لە هەولێر.



## جۆرەکانی ئاو

ئـاوی سەر زەوی لـە زەریـاو دەریـاکـانـەوە دەبینرێت، ئەویش **ئاوی سوێرە** لە بەرئەوەی خـوێی تـێدایـە. ڕێژەی ئـاوی سوێری سەوزایـی دەگاتە ٩٧٪ی سەرجەم ئاوی زەوی.

لە بەرامبەردا بەشێکی زۆر کەم لە ئاوی سەر زەوی ئـاوی سازگـارە. **ئـاوی سازگـار** ئەو ئاوەیەکە بڕێکی زۆر کەم لە خوێی تێدایە، تا هەندێکی بە تەواوی بێ خوێیە بەڵام زۆربەی ئاوی سازگار لەسەر زەوی بەشێوەی بەستەڵەکە.

✔ **دوو جۆرەکانی ئاوی سەر زەوی چیین؟**







زۆربەی ئاوە سازگارەکانی سەر زەوی بەستەڵەکە. ڕوبارە سەهۆڵینەکان و پارچە سەهۆڵەکان دەیەکی ڕووبەری زەوی دادەپۆشن، ئەم چیا سەهۆڵینە لە ڕووبارێکی سەهۆڵی جیابۆتەوە و ئیستا کەوتۆتە سەر ئاوی زەریاکان.



▲ ئاوی ژێر زەوی دێتە دەرەوە بۆ سەر زەوی لە شێوەی کانیاو وەك ئاوی بێخاڵ لە هەرێمی کوردستان کە لە وێنەی سەرەوەدا دیارە.

## ئاوی سازگار

ئاوی سازگاری سەر زەوی لە ئاوی باران و بەفراوەوە دێت. لەسەر ڕووی زەوی ئاوی سازگار لە ناو ڕووبارەکان و گۆمەکان و زۆربەی دەریاچەکاندا هەیە. هەروەها ئاوی سازگار لە ژێر زەویدا هەیە و پێی دەڵێن **ئاوی ژێر زەوی**.

لەو کاتەی کە خۆشاوێك دەخۆیتەوە، تۆ ئاوی سازگارت بەکارهێنا، یان شینایییەکان ئاو دەدەیت، یان چێشت لێدەنیت.

ئاوی سازگاری ڕووبارەکان بەکاردەهێنیت بۆ بەرهەم هێنانی کارەبا بەم شێوەیە: بەنداوەکان دروست دەکرێن لە سەر ڕووبارەکان بەمەش دەریاچە پەیدا دەبن. ئاوی دەرپەڕیوو لە دەریاچەکان لە دواوەی بەنداوەکان ئەو ئامێرانە دەسووڕێنێت کە کارەبا بەرهەم دێنن.

✔ **ئاوی سازگاری سەر زەوی لە کوێدا هەیە؟**

بەنداوی دەربەندیخان ▼

ئاوی هاتووە خوار بە خێرایی دەگاتە کارگەی دروست کردنی کارەبا ئینجا کارەبا بەرهەم دێت

ئاوی ڕووبار لە پشت بەنداو کۆ دەبێت

ئاو بەرەو خوارەوە بە خێرایی دەڕوات بەهۆی ئەم بۆڕیانە

دوای بەکار هێنانی ئاو بۆ بەرهەم هێنانی کارەبا بۆ ئاودانی کشتوکاڵ بەکاردێن.

## پاراستنی ئاوی سازگار

بۆ دابین کردنی بەشێکی باش لە ئاوی سازگار و پاك بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵ ، پێویستە پارێزگاری بکرێت بە جۆرێکی ڕاست و دروست بەکاربهێنرێت. ئاو بۆ ماوەیەکی کەم بەکاربهێنە شێرەی ئاوەکە دابخە لە کاتی ددان شوشتندا، بۆ ئەوەی ئاو پیس نەبێت پێویستە بۆیە و زەیت یان هەر شلەمەنیەکی دیکە کە زیان ببەخشێت نەکرێتە ناو بۆڕی زێرابەکان. تاکو تێکەڵ بە ئاوی خواردنەوە نەبێت و پیس نەبێت.

✔ چۆن دەتوانین ئاوی سازگار بپارێزین؟

## تیشکێك لەسەر بابەتەکە



- ڕێژەی دابارین لە هەرێمی کوردستان لە نێوان ٣٠٠ و ١٢٠٠ ملم لەساڵێکدا.
- ڕێژەی دابارین لە هەرێمی کوردستان بەرەبەرە زیاد دەبێ لە دەشتەوە بۆ شاخەکان.



- نیوەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی هەرێمی کوردستان زەوی دێمین.
- لە هەرێمی کوردستان زیاتر لە ٢٠ هەزار بیری ئاو هەیە.



کارگەیەکی دووبارەکردنەوەی ئاوی خواردنەوە لە هەرێمی کوردستان



- هەر تاکە کەسێك لە هەرێمی کوردستان ڕۆژانە ٤٥٠ لیتر ئاو یان زیاتر لە دوو بەرمیل لە ئاوی سازگار بەکار دەهێنێ بۆ پێداویستی جۆراوجۆر وەکو خواردن و چێشت لێنان و شوشتن و کشتوکاڵ و پیشەسازی.

# ئاوی سازگار لە شارەكانی هەولێر و سلێمانی و دهۆك



ڕاكێشانی ئاو لە ڕووباری زێی گەورە

## هەولێر

هەولێری پایتەخت لە دوو سەرچاوە ئاوی سازگاری بۆی دێت.


دووبارەكردنەوەی ئاو دوای ڕاكێشانی لە ڕووبارەوە.

### ١ ئاوی سەر زەوی

ئەم ئاوە لە ڕووباری زێی گەورە ڕادەكێشرێت، دووبارە دەكرێتەوە بۆ ئەوەی خاوێن بێت، لە دوایدا دەدرێت بە ماڵان.

٪٥٠
ئاوی سەر زەوی

٪٥٠
ئاوی ژێر زەوی

### ٢ ئاوی ژێر زەوی

لە ٤٥٠ بیری قوڵ پێكهاتووە، ئەو ئاوەی لێیان هەڵدەقوڵێت دەردرێت بە ماڵان لە هەولێر.


بیرێكی دەرهێنانی ئاوی ژێر زەوی

## سلێمانی

سلێمانی ئاوی سازگاری لە سێ سەرچاوەوە بەدەست دەکەوێت.

### ١ ئاوی بەنداوی دوکانی سەر زەوی

ئاوی زێی بچووك لە پشتەوەی ئەم بەنداوەوە کۆ دەبێتەوە، دووبارە دەکرێتەوە بۆ ئەوەی خاوێن بێت لەدوایدا دەدرێت بە ماڵان.

بەنداوی دوکان

دەریاچەی سەرچنار

٪٧٠ ئاوی بەنداوی دوکان

٪٢٥ ئاوی دەریاچەی سەرچنار

٪٥ ئاوی بیرەکان

### ٢ ئاوی دەریاچەی سەرچنار

ئاوی ١٨ کانی لەم دەریاچەیە کۆ دەبێتەوە، ئاو لەم دەریاچەیە ڕادەکێشرێت و دووبارە دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بە تەواوی خاوێن بێت و لە دوایدا دەدرێت بە ماڵان.

### ٣ ئاوی ژێر زەوی

لە ٣٢ بیری قوڵ پێکهاتووە، ئەو ئاوەی لێیان هەڵدەقولێت دەدرێت بەماڵان.

## دهۆك

دهۆك لە دوو سەرچاوە ئاوی دەست دەکەوێت.

### ١ ئاوی سەر زەوی

ئەم ئاوە لە ڕووباری دیجلە ڕادەکێشرێت، دووبارە دەکرێت و خاوێن دەبێت بەتەواوی و دەدرێت بەماڵان.

### ٢ ئاوی ژێر زەوی

ئەم ئاوە لە ٨٠ بیری قوڵ دێت و ئاوە هەڵقوڵاوەکەش دەدرێتە ماڵەکانی دهۆك.

ڕووباری دیجلە

وێستگەی دەرهێنانی ئاو

٪١٠ ئاوی ژێر زەوی

٪٩٠ ئاوی سەر زەوی

دەرهێنانی ئاو لە ڕووباری دیجلەوە

## ئاوی سوێر

ئاوی سوێری زەریاکان دوو لەسەر سێی ڕووی زەوی دادەپۆشێت. زەریای هێمن گەورەترین زەریای سەر زەوییە، ئەوەندە گەورەیە کە هەموو وشکانی زەوی تێیدا جێ دەبێتەوە. ڕەنگە لە لات وا بێت کە ئاوی زەریا و دەریاکان گرنگ نییە، چونکە تۆ ئاویان لێ ناخۆیتەوە.

داهاتی زەریاکان گرنگە چونکە ماسی و گیانەوەران و ڕووەکەکانی تری زەریاکان خۆراکێکی گرنگن بۆ ملیۆنەها مرۆڤ.

✔ ئاوی سوێری سەر زەوی، لە کوێ هەیە ؟




ئاو بە ڕێژەی ٧٠٪ی گۆی زەوی دادەپۆشێت.



ماسییەکانی دەریاو زەریاکان سەرچاوەیەکی خۆراکی گرنگن بۆ مرۆڤ.



کەشتییە گەورەکان و تایبەتمەندەکان کە ئامێری زۆریان تێدایە بۆ ڕاوکردنی ماسی لە پانایی زەریاکاندا.



هەندێك جێگا ئاوی سازگاریان زۆرکەمە وێستگەی تایبەت بە سازگارکردنی ئاو، خوێ لەئاوی زەریاکان لادەبات و دەیکاتە ئاوی سازگار.

## پوختە

ئاو دوو لەسەر سێی ڕووی زەوی داپۆشیوە و زۆربەی ئەم ئاوانە سوێرن، لە ناو ئاوی زەریا و دەریادا هەیە. ئاوی سازگار لە ناو ئاوی دەریاچە و گۆماو و ڕووبار و کانییەکان و ژێرزەوی هەیە. بێ ئاو ژیان نابێت.

## پێداچوونەوە

١. سێ ڕێگای بەکارهێنانی ئاوی سازگار بژمێرە ؟

٢. بە ئاوی ناو ناخی زەوی چی دەڵێن؟

٣. سوودەکانی زەریاکانی زەوی چییە؟

٤. لەبەر چی زاناکان وا باوەڕدەکەن کە ئاوی بەستەڵەکەکانی سەر زەوی داهاتی گرنگن؟

٥. **ئامادەکاری بۆتاقیکردنەوە** کام لەم سیفەتانەی خوارەوە، سیفەتێکی ڕاستە بۆ هەموو جۆرە ئاوێکی زەریا؟

أ شلەتێنە ج سازگارە

ب سوێرە د بەستوویەتی



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### بەکارهێنانی زانیارییەکان

ئەو زانیارییانەی لاپەڕە ١٠٧ بەکاربێنە بۆ جێبەجێ کردنی هێلکارییەك بە شێوەی ستوون ، دابەشبوونی ئاوەکانی زەوی بۆ ئاوی سازگار و سوێراو(ئاوی سوێر) ڕوون بکاتەوە.



بەستنەوە بە هونەرە جوانەکان

### زنجیرەیەکی شۆڕبوو

لێکۆڵینەوەیەك بکە لەسەر ئەو گیانەوەرانەی کە لەزریاکاندا دەژین، لە دوایدا زنجیرەیەکی شۆڕ بوو ئەنجام بدە ئەم گیانەوەرانەی تێدا دیاری کرابن.

وانەی 

# سوڕی ئاو چییە ؟

لەم وانەیەدا ...

**لێدەکۆڵینەوە**

دەربارەی چۆنێتی بە هەڵمبوونی ئاوی سازگار و ئاوی سوێر

**فێر دەبیت**

دەربارەی چۆنێتی جوڵانەوەی ئاو و لەسەر ڕووی زەوی و هەوا.

**زانستەکان دەبەستینەوە**

بەنووسین و هونەرە جوانەکان.



## لێدەکۆڵمەوە

# بە هەڵمبوون

**ئامانجی چالاکییەکە** لە کاتی باران بارینی زۆردا ، گۆمی تەنکاو دروست دەبن ، دوای باران بارین ئەو گۆمانە نامێنن. بەم کرداره دەڵێن کرداری بەهەڵم بوون. لەم چالاکییەدا گۆڕاوەکان ڕێك بخە تاکو بزانی کە هەندێ جۆرە ئاو لە جۆری تر خێراتر دەبێت بەهەڵم.

### کەرەستەکان

- شریتی لکاندنی ناڕوون
- چوار دەفری چونیەك
- دوو دەمەوانە بۆدوو لەم چوار دەفرە
- پێوەر
- ئاو
- خوێ
- کەوچك
- ڕاستە

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ پارچەیەك شریتی لکاندنی ناڕوون بە ستوونی لە لایەکی هەر دەفرێکدا بلکێنە(وێنەی أ)

٢ بەهۆی پێوەرێك نیو کوپ ئاو بکەرە هەر یەکێك لەو دەفرانە. کەوچکێك خوێ بکە ناو هەر یەکە لە دوو دەفرەکەوە. تێکەڵاوەکە بجووڵێنەوە و نیشانەی (خ) لەسەر هەردوو دەفرەکە دابنێ. نیشانەی (س) لەسەر هەردوو دەفرەکەی تر دابنێ.

(خ) = خوێیاو

(س) = ئاوی سازگار



ئەو ئاوەی لەسەر دەنکە گێلاسەکان (کەرز)دا هەن، دەگۆڕێت بۆ سەهۆڵ(شەختە) بەهۆی ساردی ئاووهەواوە، گەرمی خۆر دەبێتە هۆی شلبوونەوەی ئەم سەهۆڵە.



وێنەی أ




وێنەی ب

٣ نیشانەیەك لەسەر شریتێکی لکاندن بۆ هەر دەفرێك دابنێ لەو ئاستەی ئاوەکەی تێدایە، پاشان دەمەوانەیەك لەسەر دەفری (خ) و دەفری (س) دابنێ (وێنەی ب).

٤ پێشبینی ئەو دەفرە بکە کە یەکەم جار بە هەڵم بوونی تیا ڕوودەدات. پێشبینییەکەت تۆمار بکە.

٥ هەموو دەفرەکان لەبەر خۆر دابنێ.

٦ سەرنجی دەفرەکان ڕۆژانە بدە بۆ ماوەی هەفتەیەك، هەموو ڕۆژێك نیشانەیەك لە ئاستی ئاوەکە لەهەر دەفرێك دابنێ.

## دەرئەنجام بکە

١. ئایا ئاو بە تەواوی لە یەکێك لە دەفرەکان بووە بە هەڵم ؟ لە کام دەفردا ئەمە ڕووی داوە؟

٢. بەراورد بکە لە نێوان پێشبینیەکەت و ئەو ئەنجامانەی کە بەدەستت هێناوە. چۆن گەیشتیتە پێشبینییەکەت ؟ ئایا پێشبینییەکەت ڕاست بوو ؟

٣. **زاناکان چۆن کار دەکەن** بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکانی هەندێك پرسیار، زاناکان چەند تاقیکردنەوەیەك لەسەر ئەو شتانەی کە دەگۆڕێن ئەنجام دەدەن، بەم شتانە دەڵێن (گۆڕاوەکان). لە پاشدا زاناکان شتێك دەخەنە سەر تاقیکردنەوەکە، دەزانن کە ناگۆڕێت ئەم شتە پێی دەگوترێ (ڕێکخەر). ڕێکخەرەکان لەم چالاکییەدا چین ؟

کارامەیە | گردەییەکانی | زانست

ڕێکخەرەکە، دەری دەخات کەچی ڕوودەدات ئەگەر هیچ گۆڕاوێك تاقی نەکرابێتەوە. ڕێکخستنی گۆڕاوەکان ڕێگەیەکە بۆ زاناکان دەردەخات کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان ڕاستن.



## فێردەبم

# سوڕی ئاو

ئاو دەگوازرێتەوە لەسەر ڕووی زەوی بۆ هەوا، وە لە هەوا دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی. گواستنەوەی ئاو دوبارە دەبێتەوە هەردەم لە نێوان زەوی و هەوا. گواستنەوەی ئاو لەسەر ڕووی زەوی بۆ هەوا، وە لە هەواوە بۆ سەر زەوی پێی دەڵێن **سوری ئاو**.

**بناسە**

- چۆن دۆخی ئاو دەگۆڕێ چۆن ئاو دەگوێزرێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

**زاراوەکان**

سوڕی ئاو
بەهەڵمبوون
چڕبوونەوە
دابارین

**چی ڕوو دەدات لەکاتی سوڕی ئاو**

٣ هەڵمی ئاو سارد دەبێتەوە و **چڕدەبێ** یان دەگۆڕێت بۆ دلۆپە ئاوی بچووک.

٢ هەڵمی ئاو بەرز دەبێتەوە و بە هەوای سارد دەکەوێت

١ بەگەرمی خۆر ئاو و هەوا گەرم دەبن ئاو بەهەڵم دەبێ، واتە دەگۆڕێت بۆ گاز بەم کردارە دەڵێن **بەهەڵم بوون**.

٤

دڵۆپە ئاوی بچووك لەگەڵ
تۆز لە هەوادا یەك دەگرن
و هەور دروست دەكەن

٥

دڵۆپە ئاوەكان یەكتر
دەگرن و گەورەتر دەبن،
دەبارێن وەك باران یان
تەزرە یان بەفر.

٦

ئاوی داباریوو بە ڕووبارەكان
دێتە خوارەوە وە دەڕوات بۆ
دەریاچە و دەریاو زەریاكان
وە سوڕی ئاو دوبارە دەست
پێ دەكاتەوە.



## چۆن باران پەیدا دەبێت؟



هەور پەیدا دەبێت لەو کاتەی کە هەڵمی ئاو سارد دەبێتەوە، لە دوایدا دڵۆپە ئاوی زۆر بچووک دروست دەکات.



دڵۆپە بچوکەکان بەر یەکتر دەکەون و دڵۆپە ئاوی گەورە دروست دەکەن.



لەوکاتەی دڵۆپەکان گەورەو زۆر قورس دەبن. دەبارێن لە شێوەی باران.

## چۆن دۆخی ئاو دەگۆڕێت



بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی ئاو، دەگۆڕێت بۆ هەڵمی ئاو.

هەڵمی ئاو کە نابینرێت

نزم بوونەوی پلەی گەرمی ئاو دەگۆڕێت بۆ شل.



نزم بوونەوەی پلەی گەرمی ئاو دەگۆڕێت بۆ سەهۆڵ.



بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی سەهۆڵ دەگۆڕێت بۆ شلە (شلی دەکاتەوە)

## پوختە

سوری ئاو بەهۆی بەهەڵمبوون و چڕبوونەوە دەگوێزرێتەوە بۆ داباریین لە دوایدا سەرلەنوێ بەهەڵمبوو دەبێتەوە.

## پێداچوونەوە

١. بەهەڵمبوون چییە؟

٢. چۆن هەورپەیدا دەبن؟

٣. دوایی داباریین، چۆن سوڕی ئاو تەواو دەبێت؟

٤. چی ڕوودەدات ئەگەر دوایی بەهەڵمبوون، چڕبوونەوە ڕوونەدات؟

٥. ئامادەکاری بۆتاقیکردنەوە سوڕی ئاو بەم زنجیرەیە تێپەر دەبێ؟

أ  داباریین، بەهەڵمبون. چڕبوونەوە

ب  چڕبوونەوە، بەهەڵمبون، ڕۆیشتن.

ج  بەهەڵمبون، چڕبوونەوە، داباریین.

د  بەهەڵمبون، داباریین، چڕبوونەوە.



هەوری پەرش و بڵاو لە ئاسمانی هەرێمی کوردستان



## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە نووسین

**وەسف کردن**

پشکنین بکە بۆ وێنەکانی سوڕی ئاو لەناو هەندێ گۆڤار دا، بۆ هەر وێنەیەك ڕستەیەك بنووسە، تیایدا ئەوەی ڕوودەدات ڕوون بکەرەوە یەکێك لە ئەندامەکانی خێزانت بەشداربکە لەم چالاکیەدا.



### بەستنەوە بە هونەرە جوانەکان

**لکێنەری سوری ئاو**

وێنەیەك جێبەجێبکە بۆ سوڕی ئاو لەسەر لکێنەرێك، وە بەشەکانی سوڕی ئاو لە سەری دیاربکە.

# بەندی ٢ پێداچوونەوە و ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

زاراوەی گونجاو بۆتەواوکردنی ڕستەکان لە ١ تا ٥ لەمانەی خوارەوە هەڵبژێرە. ژمارەی لاپەڕە تۆمارکراوەکەی نێوان ( ) دەستنیشانی شوێنی زانیارییەکان دەکات لەبەندەکەدا کە لەوانەیە پێویستیت پێی بێت.

ئاوی ژێرزەوی (١٠٨)　　چڕبوونەوە (١١٦)
سوڕی ئاو (١١٦)　　دابارین (١١٧)
بەهەڵم بوون (١١٦)

١. ئەو ئاوەیە کە دەبارێتەوە سەر زەوی وەك باران یان تەرزە یان بەفر بریتییە لە ______ .

٢. ئەو کردارەی ئاوی شل دەگۆڕێت بۆ هەڵم بریتییە لە ______ .

٣. ______ بریتییە لە گواستنەوەی ئاو لە ڕووی زەوییەوە بۆ هەوا پاشان سەرلەنوێ گەڕانەوەی بۆ سەر ڕووی زەوی.

٤. ئاوی سازگار لە ژێر زەویدا پێی دەوترێ ______ .

٥. ئەو کردارەی کەهەڵمی ئاو دەگۆڕێت بۆ دلۆپی بچوك بریتیە لە ______ .

## بەستنەوەی چەمکەکان

دەستەواژەی گونجاو لەسەر نەخشەی چەمکەکان بنووسە ، ئەو دەستەواژانەی لە خوارەوە هاتوون بەکاربهێنە.

هەڵمی ئاو　　هەور　　باران



## دڵنیا بوون لە تێگەیشتن

بازنەیەك بە دەوری پیتی هەڵبژێراوی گونجاودا بنێ.

١. ئەو شتە چییە کە بەشی زۆری لە ئاو دروست بووە؟

أ تاوێرەکان ج سەدەفەکان

ب ڕووەکەکان د خاك

٢. لە سوڕی ئاودا گەرمی لەکوێوە دێت؟

أ لە خۆرەوە ج لە خاکەوە

ب لە باوە د لە زەریاوە

٣. ئاوی سازگار نییە لە:

أ ژێر ڕووی زەویدا ج زەریاکاندا

ب دەریاچەکاندا د ڕووبارەکاندا

٤. بەفر و باران دوو شێوەن:

أ دابارین ج چڕبوونەوە

ب ئارەق کردن د بەهەڵمبوون

وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەرەوە

٥. گرنگی ئاو بۆ زیندەوەران دیاربکە.

٦. باسی بکە بۆچی خۆر گرنگە بۆ سوری ئاو.

## پێداچوونەوەی کارامەیی کردەکانی زانست

١. گریمانێك دانێ ئەگەر یەکێك داوای لێ کردیت کە پێی بڵێیت بڕی ئەو ئاوەی کە پۆلەکەت بەکاری دەهێنێ چەندە ؟ باسی بکە کە چۆن بەکارهێنانی ژمارەکان لە کارەکەتدا کارەکەت ئاسان دەکات لەو کاتەی کە تۆ زانیارییەك دەربارەی بڕی ئاو ڕێك دەخەیت.

٢. لەو کاتەی کە تۆ دڵۆپە ئاوەکان دەبینیت کە دێنە خوارەوە ، چۆن دەتوانیت نموونەیەك دروست بکەی تا دەریبخەیت چی ڕوودەدات لە بارانەکە؟ ئاگادارمان بکە چۆن دەتوانی گۆڕانکارییەکان ڕێك بخەی بۆ دیاری کردنی ڕووداوەکە.

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی بۆ سوڕی ئاو بکێشە. لەگەڵ هاوڕێیەکتدا وێنەیەکی سادە بۆ سوڕی ئاو بکێشە. ناونیشان بۆ گۆڕانەکانی ئاو دابنێ هەروەها ڕوونیبکەرەوە ئایا لەکاتی هەر گۆڕانێکدا ئاوەکە گەرم دەبێت یان سارد دەبێتەوە؟



## بەندی ٣

# جووڵەی تەنەکان لە سیستمی خۆردا

### زاراوەکان

- سیستمی خۆر
- هەسارە
- هەیڤ
- خولگە
- ئەستێرە
- هەسارۆك
- ڕووەکانی هەیڤ
- هەیڤ گیران
- خۆرگیران

کاتێ سەیری ئاسمان دەکەین لە شەوێکی سامالّدا چەند خالّێکی بچووکی پرشنگدار دەبینی. ئەگەر توانیت زەوی بەجێبهێڵێت و گەشتێك بۆ ئاسمانی دەرەوە بکەیت و بۆ نزیك بوونەوە لەو ڕووناکیانە ، ئەوا جیهانێکی دیکە و خۆری دیکە دەبینیت. بەڵام لەو زەوی و خۆرەی کە تۆ دەیناسیت، جیاوازن.

### زانیارییەکی خێرا

ئەگەر تۆ ئارەزووی زانینی ساردترین شوێن لە سیستمی خۆردا بکەیت، ڕووبکە تریتۆن، کە ئەمە گەورەترین هەیڤی هەسارەی نیپتۆنە. پلەی گەرمی ئەم هەیڤە ٢٣٥ پلەی سیلیزییە لە ژێر سفرەوە. تریتۆن زۆر باردە بە شێوەیەك کە لە گڕکانەکانیدا بەفر دەردەچێت لە جیاتی گڕتاو.

## زانیارییەکی خێرا

خۆر زۆر گەورەیە بە شێوەیەکە کە دەتوانێت شوێنی زیاتر لە ملیۆنێك وەك هەسارەی زەوی بگرێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا خۆر ئەستێرەیەکی قەبارە مامناوەندییە. ئەمەش بەراوردێکە لە نێوان خۆر و هەندێ لە گەورەترین ئەستێرەکان کە بە شەو دەیانبینین.



### پێوانی هەندێ لە ئەستێرەکان

| ئەستێرە | تیرە(بەکیلۆمەتر) |
|---|---|
| خۆر | ١ ٤٠٠ ٠٠٠ |
| میوسیفی | ٤ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ |
| ڤی ڤی سیفی | ٤ ٦٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ |
| ئەبسیلۆن ئۆریگا(عەنز) | ٤٢٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ |

ئەم وێنەیە دەریدەخات کەچۆن ڕووی تریتۆن دەردەکەوێت بەبۆچوونی زاناکان.

## وانەی ١

# ئەستێرەکان و هەسارەکان چیین؟

لەم وانەیەدا ...

لێدەکۆڵیتەوە
لە ئەستێرەو ڕووناکی

فێردەبیت
ئەستێرە و هەسارەکان

زانستەکان دەبەستیتەوە
بە نووسین و تەندروستییەوە



## لێدەکۆڵمەوە

# ئەستێرە و ڕووناکی

**ئامانجی چالاکییەکە** خۆر ئەستێرەیەکی زۆر بریقەدارە لە توانامان دایە لە ڕۆژ ببینین. لەبەر چی ناتوانین ئەستێرەی دیکە ببینین؟ لەم چالاکییە دا باس لە بینی ئەستێرەکان دەکەین لەشەودا وە ڕوونی دەکەی لەبەرچی ناتوانین لە ڕۆژدا بیانبینین.

### کەرەستەکان

- کاغەزی ڕەش شەریتی لکێنەر
- گڵۆپی کارەبایی
- کوپی ستایروفۆم

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ چەند کونێك لەبنکی کوپەکە بکە.

٢ کاغەزی ڕەش لە دیوار هەڵبواسە. بنکی کوپەکە ئاراستەی کاغەزەکە بکە گڵۆپە کارەباییەکە لەناو کوپەکەدا دابگیرسێنە وە ئەوەی کە دەیبینی چییە؟



► تەلسکۆب بەکاردەهێنرێت بۆ دیتنی تەنەکانی زۆر دوور.





٣ ڕووناکی ناو هۆڵەکە بکوژێنەوە. دوبارە کلۆپەکە دابگیرسێنەوە. ئیستا چی دەبینی؟

٤ دیاری بکە بۆچی ئەستیرەکان، وا دیار دەکەون کە جیاواز بن لە کاتی بوونی ڕووناکی لە هۆڵەکە، وە لە نەبوونی ڕووناکیدا؟

## دەرئەنجام بکە

١. لەبەر چی «ئەستێرەکان» بەتەواوی دیار نابن.

٢. چی ڕوودەدات بۆ ئەستێرەکان ئەگەر گلۆپی کارەبایی داگیرسا لە شوێنێکی دورتر لە بنکی کوپەکەوە.

٣. **چۆن زاناکان کاردەکەن** زاناکان ئەوەی دەبینن بەکاری دەهێنن بۆ دەرئەنجام کردنی هۆی ڕوودانی ئەم شتە. دەرئەنجام بکە لەبەر چی هەندێ لە «ئەستێرەکان» بریقەدار ترن لە جۆری دیکەیان لەسەر کاغەزی ڕەش. لەکاتی ئەنجامدانی چالاکییەکە؟

کارامەیە | کردەییەکانی | زانست

لەکاتی دیارکردن، ئەوەی کە تێبینی دەکەیت بەکاری دەهێنی بۆ ئەوەی بتوانی بزانی هۆی ڕودانی ئەو شتە چییە.





## فێردەبم

# ئەستێرەو هەسارەکان

**بناسە**

- پێکهاتەکانی سیستەمی خۆر
- ئەستێرەکان

**زاراوەکان**

سیستمی خۆر
هەسارە
هەیڤ
خولگە
ئەستێرە
هەساڕۆك

## هەسارەکان

بەشێوەیەکی بنچینەیی **سیستەمی خۆر** پێکهاتووە لە خۆر و هەسارەکان و هەیڤەکانیان. **هەسارە** تەنێکی تاوێری یان گازی گەورەیە بەدەوری خۆردا دەسورێنەوە. **هەیڤ** تەنێکی تاوێری گەورەیە بە دەوری هەسارەیەك دەسورێتەوە. خۆر بریتیە لە چەقی سیستەمی خۆر. وە هەسارەکانیش بە ڕێڕەوی تایبەت لە دەوری خۆردا دەسورێنەوە، وە هەر ڕێرەوێك پێی دەوترێت **خولگە**.




سیستەمی خۆر لە هەشت هەسارە پێکهاتووە، زەوی یەکێکە لەم هەسارانە ئەم هەسارانە لەیەکتری جیاوازن لە شێوە و قەبارە و دووری لە خۆر وە لە ژمارەی هەیڤەکانیان. هەسارەی زەوی یەك هەیڤی هەیە، وە هەسارەکانی دیکە چەند هەیڤیان هەیە، وە هەندێ جۆری هەسارە هەیڤی نییە.

مەریخ
زەوی
زوهرە
عەتارد
خۆر

لە تواناتدایە هەندێ لە بەشەکانی سیستەمی خۆر لە شەودا ببینی. لە رۆژدا ئەم بەشانە لە شوێن خۆیان دەمێننەوە بەڵام لە توانامان دانیە بیان بینین لە بەر بەهێزی تیشکی خۆر.

### ✔ سیستەمی خۆر لەچی پێکهاتووە؟




▲ زەوی زۆر بچوکە بە بەراوردکردن لە گەڵ خۆرداو دەکرێ خۆر زیاتر لە یەك ملیۆن هەسارە لەخۆی بگرێتەوە وەك هەسارەی زەوی.

نبتۆن

ئۆرانۆس

زوحەل

موشتەری

## ئەستێرەکان

**ئەستێرە** گۆیەکی زۆر گەورەیە لە گازی گرگرتوە. گازە گەرمەکان ڕوناکی و وزە و گەرمی یان لێ دەردەپەڕێت. وە خۆر نزیکترین ئەستێرەیە لە زەوی.

دەکرێ خۆر لە ڕۆژدا ببینرێت بەڵام زۆربەی ئەستێرەکانی دیکە تەنها لەشەو دەبینرێن، ئەمانیش گەورەترو بچوکترن لە خۆرەوە وە بەگشتی وەك خاڵی بچوکی درەوشاوە دیاردەبن، چونکە زۆر دوورن لە زەوی.

ئەگەر لەکاتی شەوان سەیری ئاسمان بکەیت، ئەوا چەند کۆمەڵە ئەستێرەیەکی لێ نزیك دەبینیت وە شێوەی جیاواز و تایبەتیان هەیە، ئەم کۆمەلە ئەستێرانە بە **هەسارۆکە** ناو دەبرێن وە بۆ هەر هەسارەیەك ناوێکی تایبەت و دیاری کراو هەیە وەك ورچی گەورە و ورچی بچوك وەك ئۆریۆن.

شێوەی هەسارۆکە (ئۆریۆن) هەروەك فەلەك ناسەکان وێنەیان بۆ کێشاوە.

✔ ئەستێرە چییە؟



ئەو وێنەیە لەلای ڕاست وێنەی ورچی گەورەیە وە وێنەی ورچی بچووك، وە لە وێنەکەدا شێوەی هەردوو هەسارۆکەکان دیارە هەروەك فەلەك ناسی کۆن وێنەیان بۆ کێشاوە. وە لەسەر بنەمایی ئەم وێنانە ناوەکانیان هاتووە.





## بەستنەوەکان



### بەستنەوە بە نووسین

**راپۆرت لەسەر هەسارە**

هەسارەیەك دەستنیشان بکە. چوار زانیاری لەسەری دیاربکە و لە راپۆرتێك بیانووسە، وە نمایشی بکە بۆ هاورێکانت لە پۆلدا.



### بەستنەوە بە تەندروستی

**خۆ پاراستن لە تیشکی خۆر**

تیشکی خۆر لەوانەیە زیان بە پێستت بگەیەنێ لەبەر ئەوە خەڵك ئامادەکراوی پاراستن لە تیشکی خۆر بەکاردێنن. ئەم ئامادە کراوە و پاراستنانە هێمای جیاجیای هەیە پێی دەڵێن هۆکاری پاراستن لە خۆر SPF. لەگەڵ یەکێکی گەورەی ئەندامی خێزانەکەت برۆ بۆ دەرمانخانە ، تاکو زانیارییەك دەربارەی ئەو ئامادەکراوانەی کە بەکاریان دەهێنن بۆ پاراستنی پێست لە هاویندا. دەپرسێت دەربارەی ئەو هێمایانەی کە هاتوون لەسەر ئامادەکراوەکان.



▲ ئەمە وێنەی هەسارۆکەی ئۆریۆنی زەبەلاحە کە لە زەویەوە دەبینرێت، هەوڵبدە شێوەکەی دیاربکەیت بەبەکارهێنانی وێنەی ناو بازنەکە.

## پوختە

لە سیستەمی خۆردا هەشت هەسارە هەیە، لە دەوری خۆر دەسورێنەوە. هەسارەی زەوی یەکێکە لەم هەسارانە. ئەستێرەکان گۆی زۆر گەورەن لە گازی گرگرتوو وە خۆریش یەکێکیانە. ئەستێرەکان لە کۆمەڵی دیاریکراو دەردە کەون بە هەسارۆکەکان دەناسرێن.

## پێداچوونەوە

١. ژمارەی هەسارەکانی سیستەمی خۆر چەندن؟

٢. جیاوازی چییە لە نێوان هەسارە و ئەستێرە؟

٣. لەبەرچی خولگەی زوحەل درێژترە لە خولگەی زەوی؟

٤. جیاوازی چییە لە نێوان هەسارە و هەسارۆکە؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** کاتی لەبار بۆ بینینی ئەستێرەکان چیە؟ ________ .

أ بەیانیان　　ج رۆژ

ب دوای نیوەرۆ　　د شەو

## وانەی ٢

# لە جووڵەی هەیڤ و زەوی چی پەیدا دەبێت ؟

لەم وانەیەدا . . .

لێدەکۆڵیتەوە
لە ڕووەکانی هەیڤ

فێر دەبیت
بۆچی هەیڤ وا دەردەکەوێت هەروەکو ئەوەی کە لە گۆڕاندا بێت.

زانستەکان
دەبەستیتەوە
بە بیرکاری و نووسین



## لێدەکۆڵمەوە

# ڕووەکانی هەیڤ

**ئامانجی چالاکییەکە** ئەگەر هەموو شەوێك سەیری هەیڤت کرد، وای دەبینی کە شێوەکەی دەگۆڕێت . بەم شێوانە دەوترێت (ڕووەکانی هەیڤ) لەم چالاکیەدا دەیبینیت کە چۆن ئەو ڕووناکییەی کە دەخرێتە سەر تۆپێك بە جیاواز دەردەکەوێت. تۆش ئەم ڕووناکییە بە دەوری تۆپەکەدا دەسووڕێنیتەوە.

### کەرەستەکان

- گڵۆپێك
- تۆپێك

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ وێنە بەکاربهێنە لە هەنگاوی ١. مامۆستاکەت پۆلەکە تاریك دەکات. تۆپەکە بەدەست بگرە وەك لە باری ١ دا. با یەکێك لە هاوڕێیەکانت ڕووناکی گڵۆپەکە بەرەو تۆپەکە بکەن، لە هاوڕێی سێیەم داوا بکە لە ناوەڕاست بوەستێت و تێبینی تۆپەکە بکات وە وێنەی ئەو بەشەی کە ڕوناکە بکات.



تۆ هەیڤ دەبینی بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە بەڵام ئەگەر لەسەر ڕووی هەیڤ بیت. ئەوە دەبینیت کە زەوی دەسووڕێتەوە.

٢ بۆ بارەکانی ٢، ٣، ٤ بگوازەوە بۆ هاوڕێی سێیەم دەسوڕێتەوە بۆ ئەوە بتوانیٚ تۆپەکە ببینیٚ، وە سەیری ئەو بەشەی کە ڕووناکە کات و وێنەی ۆ بکێشی.

٣ لەگەڵ هاوڕێکەت کارەکانتان ئاڵوگۆڕ بکەن، بە مەرجێك تۆ بتوانێت تێبینی شێوەکانی ڕووناکی لەسەر تۆپەکە بکەیت.

وێنەی ا

وێنەی ب

| وێنەی خشتەیەك بکە بۆ تێبینی کردن | |
|---|---|
| باری ١ | باری ٢ |
| | |
| باری ٣ | باری ٤ |
| | |

## دەرئەنجام بکە

١. ئەو بەشەی تۆپەکە کامەیە کە ڕووناك بوو لە هەموو بارەکان؟

٢. تۆپەکە و گلۆپەکەو، وە ئەو کەسەی کە تێبینییەکانی تۆماردەکرد چی دەنوێنن؟

٣. **زاناکان چۆن کار دەکەن** کارامەیی دەست نیشان کردن ئەگەر تۆپەکە هەیڤ دەینواند، چی دەست نیشان دەکەیت لەسەر بەشە جیاوازەکان وە ئەو بەشەی لە تۆپەکە ڕووناك بوو؟

کارامەیە | کردەییەکانی | زانست

کاتێك تێبینی شتێك بکەیت تۆش هەستیارەکانت بەکاردەهێنی.
بۆ بەدەست هێنانی زانیاری دەربارەیان. کاتیٚ کە دەست نیشان دەکەیت. تۆ ئەوە بەکاردەهێنی کە تێبینیت کردووە تاکو ببێتە دەرئەنجام.



فێردەبم

# چی پەیدا دەبێت لە ئەنجامی جووڵانەوەی هەیڤ و زەویدا

بناسە
- تایبەتمەندییەکانی هەیڤ
- ڕووەکانی هەیڤ
- چی دەبێتە هۆی هەیڤ گیران و خۆر گیران

زاراوەکان
ڕووەکانی هەیڤ
هەیڤ گیران
خۆر گیران

## ڕووناکی هەیڤ

هەیڤ گەورەترین تەنە کە شەو بە ئاسمانەوە دەیبینی، هەیڤ وا دیارە کە ڕووناکە، بەڵام لە ڕاستیدا هەیڤ ڕووناکیدەر نیە. ئەو ڕووناکییەی هەیڤ سەرچاوەکەی خۆرە. بەڵام ڕووی هەیڤ دەیداتەوە و دەگاتە ئێمە.






## هەیڤ

هەیڤ تۆپێکی ڕەقی تاوێریە بە دەوری هەسارەی زەویدا دەسووڕێتەوە. هەیڤ پێویستی بە نزیکەی ٢٩,٥ ڕۆژ هەیە بۆ تەواوکردنی خولێك بە دەوری زەویدا کە بسووڕێتەوە.

کاتێك سەیری هەیڤ دەکەین، پەڵەی زۆری لەسەر دەبینین. هەندێك لەم پەڵانە چاڵن پێیان دەڵێن دەمیلە.

دەمیلە دروست دەبێت کاتێ تاوێرێکی گەورە دەکەوێت بە هەیڤدا، لە کاتی گواستنەوەی بەبۆشایی ئاسماندا.

✔ **کام بەشی هەیڤ خۆر ڕووناکی دەکاتەوە؟**



## ڕووەکانی هەیڤ

شێوەی هەیڤ دەگۆڕێت بۆ تەماشاکەرێك لە ڕووی زەویەوە. **ڕووەکانی هەیڤ** شێوەی دەرکەوتنی جیاوازی هەیە لە شەودا.

- لەسەرەتادا، هیچ شتێك لە هەیڤ نابینین، لەوکاتە بە هەیڤ دەڵێین «هەیڤی نوێ» یان «پەناگرتوو».
- دوای یەك بۆ دوو ڕۆژ بەشێکی باریکی هەیڤ ڕووناك دەبینین، پێی دەڵێن «هیلال» هەیڤی یەك شەو.
- لە دوای یەك هەفتە، هەیڤ لە شێوەی نیوبازنەی ڕووناك دەبینرێت وە پێی دەڵێن «تەربیعی یەکەم».
- لە دوای دوو هەفتە، هەیڤ لە شێوەی بازنەیەکی تەواو و ڕووناك دەبینرێت، پێی دەڵێن «بەدر» هەیڤی چواردە.
- دوایی سێ هەفتە دووبارە دەبینین لە شێوەی نیو بازنەیی، پێی دەڵێن «تەربیعی کۆتایی».
- دوایی چوار هەفتە واتە (٢٩،٥) ڕۆژ، هەیڤ دەگەڕێتەوە بۆ خاڵی سەرەتاییەکەی کە لێی دەرپەڕی واتە «هەیڤی نوێ» یان «پەنا گرتوو». وە هیچ شتێك لێی ڕووناك نییە.












✔ ڕووەکانی هەیڤ کامانەن؟




▲ لەم وێنانە دەردەکەوێ چۆن شێوەکانی هەیڤ دەردەکەون هەروەك رۆژانە دەیانبینین لە هەیڤی یەك شەو تا هەیڤی کۆتایی.

## هەیڤ گیران و خۆر گیران

تۆ ئێستا دەزانی کە هەیڤ بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە. هەندێ جار زەوی لە نێوان هەیڤ و خۆر دا دەبێت. ئەگەر هەیڤ و زەوی و خۆر لەسەر یەك هێلی ڕاست بن، ئەوا زەوی بەردەمی تیشکی خۆر دەگرێت. ناهێڵی بگاتە هەیڤ، ئەوا لە هەندێك کاتدا تاریك دەردەکەوێت بەمەش دەڵێن **هەیڤ گیران** .

هەیڤ گیران ڕوودەدات لەوکاتەی کە زەوی دەکەوێتە نێوان خۆر و هەیڤ. هەر سێکیان لەسەر ڕاستەهێڵێك دادەبن. لەم وێنەیە هەیڤ گیران دیار دەکات. ▼



لەکاتێ سێبەری زەوی دەکەوێتە سەر هەیڤ، هەیڤ گیران ڕوودەدات ▼




هەندێ جار هەیڤ لە نێوان زەوی و خۆردا دەبێت ئەگەر زەوی و هەیڤ و خۆر لەسەر هێڵێکی ڕاست بن ئەوا هەیڤ بەردەمی تیشکی خۆر دەگرێت. ناهێڵێت بگاتە ڕووی زەوی، بەمەش دەگوترێ **خۆر گیران** .

✔ **چی دەبێتە هۆی هەیڤ گیران و خۆر گیران؟**

کاتێ کە سێبەری هەیڤ دەکەوێتە سەر بەشێك لەزەوی، ئەوا لەو بەشەدا خۆرگیران ڕوودەدات. ▼





▲ کاتێ هەیڤ لە نێوان خۆر و زەوی دابێت ئەوە خۆر گیرانێکی تەواو ڕوودەدات و هەر سێکیان لەسەر هێڵێکی ڕاست دەبن ئەو وێنەیە خۆر گیرانێکی تەواو دەردەخات.

## پوختە

ڕووناکی هەیڤ سەرچاوەکەی خۆرە. لەسەر ڕووی هەیڤدا دەمیلەکان هەن. هەیڤ پێویستی بە نزیکەی ٢٩,٥ ڕۆژ هەیە تاکو بە دەوری زەویدا بسووڕێتەوە. ڕووەکانی هەیڤ ئەو شێوە جیاوازەیە، کە هەیڤ لە ئاسماندا لەسەریان دەردەکەوێت کاتێ سێبەری زەوی دەکەوێتە سەر هەیڤ ، هەیڤ گیران ڕوودەدات. خۆر گیرانیش کاتێ ڕوودەدات کە سێبەری هەیڤ دەکەوێتە سەر بەشێکی زەوی.

## پێداچوونەوە

١. چۆن دەمیلەکانی سەر هەیڤ پەیدابوون؟
٢. وەسفی هەیڤی نوێ بکە؟
٣. بەراوردی هەیڤ گیران و خۆرگیران بکە.
٤. هەیڤ گیران لە کام ڕووی هەیڤدا ڕوودەدات؟ وەڵامەکەت ڕوون بکەوە.
٥. ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە کام لەمانەی خوارەوە لە ڕووەکانی هەیڤ نین ؟

أ هەیڤی نوێ    ج هەیڤی یەك شەوی (هیلال)
ب هەیڤی چواردە    د خۆرگیران



## بەستنەوەکان



### بەستنەوەکان بە بیرکاری

**خەملاندنی کاتی تێپەڕبوون**
وێنەیەکی نەخشە کێشان بۆ شێوەی هەیڤ لەهەر شەوێك ئەنجام بدە بۆ ماوەی یەك مانگی تەواو. دەست پێ بکە بە هەیڤی پەناگرتوو (دەرنەچوو) ئەو کاتەی پێویستە تا هەر هەشت ڕووەکەی تەواوی هەیڤ دەرکەوێت چەندە ؟ پێشبینی مێژووی ئەو مانگە پەناگرتەی کە دێت بکە ؟



### بەستنەوە بە نووسین

**چیرۆك**
وا دابنێ کە تۆ گەشتێکت بۆ ئاسمانت کرد و گەیشتییە هەیڤ و ڕۆژێکت لە هەیڤ بردەسەر. بۆ هاوڕێکت لە وڵاتێکی دیکە چیرۆکێك بنووسە تیایدا وەسفی ڕووی هەیڤ بکە هەروەها شێوەی زەوی و ڕەنگی کە چۆنت بینیوە لەگەڵ ڕۆژهەلاتنی زەوی.

# بەندی ٣ پێداچوونەوە و ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

زاراوەی گونجاو بۆ تەواوکردنی ڕستەکان لە ١ تا ٩ لەمانەی خوارەوە هەڵبژێرە. ژمارەی لاپەڕە تۆمارکراوەکەی نێوان ( ) دەستنیشانی شوێنی زانیارییەکان دەکات لە بەندەکەدا کەلەوانەیە پێویستیت پێی بێت.

| | |
|---|---|
| سیستمی خۆر (١٢٦) | هەسارۆکە (١٢٨) |
| هەسارە (١٢٦) | ڕووەکانی هەیڤ (١٣٤) |
| هەیڤ (١٢٦) | هەیڤ گیران (١٣٦) |
| خولگە (١٢٦) | خۆر گیران (١٣٦) |
| ئەستێرە (١٢٨) | |

١. ئەو تەنە گەورەیەی کە دەسووڕێتەوە بە دەوری خۆردا پێی دەڵێن ______ .

٢. ______ ئەو شێوە جیاوازانەن کە هەیڤ تێیدا دەردەکەوێت بە ئاسمانەوە.

٣. ______ پێکهاتووە لە خۆر و ئەو تەنانەی کە بە دەوریدا دەسووڕێنەوە.

٤. ______ ڕێڕەوی تەنێکە کە بە دەوری تەنێکی تر دا دەسووڕێتەوە لە بۆشایی ئاسماندا.

٥. ______ گۆیەکی تاوێری گەورەیە کە بە دەوری هەسارەی زەویدا دەسووڕێتەوە.

٦. لەوکاتەی زەوی تیشکی خۆر دەگرێت و ڕێگای پێ نادات بگاتە هەیڤ ______ ڕوودەدات.

٧. لەوکاتەی کە هەیڤ تیشکی خۆر دەگرێت و ڕێگای پێنادات بگاتە زەوی، ______ ڕوودەدات.

٨. ______ کۆمەڵە ئەستێرەیەکی شێوە جیاوازن.

٩. ______ گۆیەکی گەورەیە لە گازە گڕگرتووەکان.

## بەستنەوەی چەمکەکان

لە جووڵەی هەر یەکە لە زەوی و هەیڤ گۆڕینی ڕووەکانی هەیڤ ڕوودەدات ئەم ڕستانەی خوارەوە بەکاربێنە بۆ پڕ کردنەوەی نەخشەی چەمکەکان.

هەیڤی نوێ　　تەربیعی یەکەم　　هیلال　　تەربیعی کۆتایی　　بەدر



## دڵنیا بوون لە تێگەیشتن

پیتی هەڵبژاردەی گونجاو هەڵبژێرە:

١. ئەستێرەکان گۆی گەورەن لە ______ .

أ تەنی رەق

ب شلەی گەرم

ج گازی گڕگرتوو

د گازی سارد

٢. لەوکاتەی هەیڤ بە شێوەی بازنەیەکی رووناك لە ئاسماندا دیار دەبێ ئەوا ______ .

أ بەدرە

ب تەربیعە

ج هەیڤی نوێیە

د هەیڤی قۆقزە

٣. سوڕانەوەی هەیڤ بە دەوری زەوی ______ . دەخایێنێ:

أ دوو رۆژ

ب ٢٩,٥ ڕۆژ

ج ١٩ ڕۆژ

د حەفت ڕۆژ

٤. رووناکی هەیڤ سەرچاوەکەی ______ .

أ ئەستێرە دوورەکانە

ب خۆرە

ج زەویە

د هەوایە

وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەرەوە:

٥. رووە جیاوازەکانی هەیڤ وەسف بکە.

٦. لەوکاتەی کە هەیڤ نووە (پەناگرتووە) لە نێوان زەوی و خۆردایە. لەبەرچی خۆر گیران روونادات؟

## پێداچوونەوەی کارامەیی کردەکانی زانست

١. بەراوردی خۆرگیران و هەیڤ گیران بکە. باری لێکچوون و جیاوازی لە نێوانیاندا چییە؟

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

١. سوڕانەوەی هەیڤ بە دەوری زەوی ماوەی ٢٩,٥ رۆژ دەخایێنێ، لەکاتی سوڕانەوەی هەیڤ وا دیاردەکەوێ کە شێوەکەی دەگۆڕێت. سێ وێنە بۆ هەیڤ هەڵبژێرە لە لاپەرە ١٣٤، ١٣٥. بۆ هەر وێنەیەك لەم سێ وێنانە، هێلکاریەك بکێشە تیایدا شوێنی خۆر و هەیڤ و زەوی دیاربێ لەوکاتەی هەیڤ وەك لەم وێنەیەدا دەبێ.



٢. بیدۆزەوە لەبەرچی هەسارە گەورەکان وەك هەسارەی بچووك دیار دەبن لە زەوییەوە. تۆپێك لە نزیك چاوەکانتەو بگرە، لە دوایدا بە هێواشی لە خۆتی دووربخەوە. پێت وایە قەبارەی تۆپەکە دەگۆڕێت. بە بۆچوونی تۆ بۆچی ئەمە روودەدات؟

# چالاکیی بۆ ماڵ یان قوتابخانە

## خاوەکانی ناو لم

### ئەو خاوانە چین کە لە ناو لمدا هەن؟

**کەرەستەکان**

- لم
- کاغەزی سپی
- هاوێنەی گەورەکەری دەستی
- داری ددان پاکژکردنەوە
- کاغەز کە سیفەتی هەندێ خاو لەسەری نووسرابێ



**هەنگاوەکان**

١ لم لەسەر کاغەزەکە دابنێ.
٢ سەیری وێنە و شێوەی دەنکۆلەکانی لم بکە، بە بەکارهێنانی هاوێنەی گەورەکەری دەستی: بۆ هەریەك لە دەنکۆلەکانی لم رەنگ و شێوەیەکی جیاواز هەیە لە جۆری دیکەی.
٣ بە بەکارهێنانی داری ددان پاکژکردن دەنکۆڵەکانی لمی هەر خاوێك لە کۆمەڵەیەکی سەربەخۆ جیابکەوە.

**دەرئەنجام بکە**

خاوەکان دەستنیشان بکە بە بەکارهێنانی سیفەتی هەر خاوێك کە مامۆستایەکەت پێتی داوە. کام جۆر لە خاوی ناو لمەکە زیاترە لە جۆرەکەی دیکە؟

## دروستکردنی دڵۆپە باران

### بۆچی دڵۆپەکانی باران دەکەون؟

**کەرەستەکان**

- دڵۆپێن
- ئاو
- سەرپۆشی ڕوونی قووتوویەکی پلاستیکی
- پێنووس

**هەنگاوەکان**

١ دڵۆپێنەکە پڕ بکە لە ئاو
٢ سەرپۆشەکە (قەباغەکە)ی سەرەو ژێر بکە بە شێوەیەك ڕووەکەی سەرەوە لەسەر مێزەکە جێگربێت.ئەوەندەی دەتوانیت دڵۆپە ئاو لەسەر قەپاغەکە دابنێ بەبێ ئەوەی دڵۆپەکان بەریەك بکەون.
٣ سەر پۆشەکە بەخێرای سەروژێربکە.
٤ بەسەرەوژێری سەرپۆشەکە بە دەست بگرە، دڵۆپەکان بەیەکەوە بەلاتیژەکەی پێنووس بجووڵێنەوە. چی ڕوودەدات؟

**دەرئەنجام بکە**

بەچی لەیەك دەچن لەگەڵ ئەوەی ڕوودەدات لە هەورەکان؟



## پرۆژەی یەکەکە

### پلەی بەستنی ئاو

ئاوی پاك دەی بەستێت، واتە دەبێتە بەفر لە پلەی سفری سەدی (سیلیلیزی)

لە کاتی خوێندنی ئەم بەندەدا، دەتوانیت نەخشەیەك بۆ تاقیکردنەوەیەکی درێژ خایەن دابنێیت ، بۆ ئەوەی بزانیت کە چۆن ماددەکانی تر کار دەکەنە سەر پلەی بەستنی ئاو ؟ بیر لە وەڵام دانەوەی ئەم دوو پرسیارەی خوارەوە بکەوە . ئایا دەتوانرێ پلەی بەستنی ئاو نزم بکرێتەوە بە تیکەڵ کردنی ماددەیەکی تر ؟ ئایا دەتوانرێت پلەی بەستنی ئاو بەرز بکرێتەوە بە تێکەڵکردنی ماددەیەکی تر؟ نەخشەیەك بۆ تاقیکردنەوەیەك بکێشەو جێبەجێ بکە بە وەڵامدانەوە لەسەر هەر پرسەکە و چەند پرسێکی تر بکە کە بەخەیاڵتدا دێت.

# بەندی



# سیفەتەکانی ماددە و گۆڕانەکانی

ئێمە رۆژانە چەندین ماددەی جۆراوجۆر دەبینین و دەیبیستین و دەستی لێدەدەین و بۆنی دەکەین، تەنانەت لەگەڵ هەناسەشدا ئەو ماددانەی هەڵدەمژین لەبەرئەوەی ماددەکان شێوە و قەبارەی جۆراوجۆریان هەیە. مرۆڤ رێگای جیاوازی گرتۆتەبەر بۆ پێوانەکردنیان

## زاراوەکان

ماددە
بارستایی
قەبارە
ژێر ئاو دەکەوێ
سەرئاو دەکەوێ
تێکەڵ
گیراوە

### زانیارییەکی خێرا

لوتکەی ئیڤرست لە زنجیرە چیاکانی هیمالایا کە بەرزترین لوتکەیە لە جیهاندا. بەرزی ئەم لوتکەیە ٨٨٤٨ مەترە. ئەمەش یەکسانە بە بەرزایی بالەخانەیەك کە ٢٩٥٠ قاتە (نهۆمە) پێوانەی ئەم لوتکەیە بەهۆی مانگی دەستکردەوە پێوانەکراوە.

## زانیارییەکی خێرا

هەستەکانمان یارمەتی تێبینی مادده و وەسفکردنیمان دەدات، سەگەکان بەوە ناسراون کە هەستی بۆنکردنیان بەهێزە. سەگە پۆلیسییەکان هەستی بۆنکردنیان بەکاردەهێنن بۆ دواکەوتنی شوێنەوارێك بۆ دوری ١٨٥ کیلۆمەتر یا زیاتر و پاش تێپەڕبوونی ١٠٠ سەعات.



| جۆری گیانەوەر | بۆنکردنی بەهێز |
|---|---|
| مێروو | کرمی ئاوریشم |
| ماسی | قرش |
| شیردەرەکان | فیل |
| وشکاوەکییەکان | سەلیمەندەر |
| باڵندەکان | قەترس |
| خشۆکەکان | مارومارمێلکە |



لێدەکۆڵمەوە

# پێوانی قەبارەی شلە

ئامانجی چالاکییەکە لەوکاتەی بە شێوەیەکی یەکسان بڕێك لە شلە دەکەوێتە ناو دوو دەفری شێوە جیاواز، تێبینی دەکەیت کە شێوەی شلەکە دەگۆڕێت و شێوە دەفرەکە وەردەگیرێت. لەم چالاکییەدا پێشبینی دەکەیت چۆن بەرزبوونی شلە لەناو دەفری جیاواز لە شێوە دەگۆڕێت.

## کەرەستەکان

- پێوەر
- ئاوی رەنگاورەنگ
- ٣ دەفری پلاستیکی روون و شێوە جیاواز
- راستە
- شریتی لکێنەر

## هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. ١٠٠ ملیلتر لە ئاوی رەنگاورەنگ بپێوە.

٢. ئاوە رەنگاورەنگەکە لە دەفرێکی روون بکە (وێنەی أ).

وانەی 

# ڕەوشەکانی مادده چین؟

لەم وانەیەدا . . .

 لێدەکۆڵیتەوە

لە چۆنیەتی قەبارەی شلەکان

 فێر دەبیت

لە هەندێ سیفەتەکانی مادده

 زانست

دەبەستیتەوە بە بیرکاری و نووسین



وادیار دەکات کە شل قەبارەی جیاوازی دەبێ لەناو دەفری جیاواز لە شێوە، بەڵام ئەمە راست نییە.


وێنەی ا


وێنەی ب

٣ پارچەیەك لە شەریتی لکێنەر بەکاربهێنە بۆ دیارکردنی ئاستی ئاو لە ناو دەفرەکە. پارچە شەریتی لکێنەر لە دەفرەکە بلکێنە، بە مەرجێك سەری شەریتی لکێنەر لەگەڵ ئاستی ئاوەکەدابێت لە دەفرەکەدا (وێنەی ب)

٤ بە راستە بەرزی ئاوی ناو دەفرەکە بپێوە. ئەنجامی پێوانەکە لە خشتەیەك تۆمار بکە.

٥ هەنگاوەکانی ١ – ٤ دووبارەی بکەوە لەگەڵ هەردوو دەفرەکەی دیکە.

| بەرزبوونی ئاوی رەنگاورەنگ لە ناو هەر دەفرێك بە (سانتیمەتر) | | |
|---|---|---|
| دەفری یەکەم | دەفری دووەم | دەفری سێیەم |
| | | |

کارامەیە کردەییەکانی زانست

زاناکان ئەوەی کە دەبینن بەکاریدەهێنن، یان ئەو داتایانەی کە هەیانە یان ئەوەی کە دەیزانن، بۆ ئەوەی پێشبینی ئەوەی کە روودەدات بکەن.

## دەرئەنجام بکە

١. قەبارەی ئاو چەندە لەناو هەر دەفرێك؟

٢. بەرزبوونی ئاو لەناو هە دەفرێك وەسف بکە. وە لەبەرچی بەرزبوونی ئاو لە دەفرێك بۆ ئەوەی کە دیکە دەگۆڕێت؟

٣. **چۆن زاناکان کاردەکەن** زاناکان هەندێجار داتاکان بەکاردەهێنن، وە ئەوەی کە تێبینی دەکەن، بۆ پێشبینیکردنی ئەوەیە کە روودەدات. پێشبینی بکە ئەوەی کە روودەدات ئەگەر ئاوی ناو هەر دەفرێك بکەیتە ناو پێوەرەکە.



فێردەبم

# جیاکەرەوەکانی مادده

**بناسە**

- مادده بناسە
- هەندێك لە سیفەتەکانی مادده و چۆن دەپێورێت.

**زاراوەکان**

مادده
بارستایی
قەبارە
ژێر ئاوکەوتن
سەرئاوکەوتن

## مادده

ئەگەر لە سەر شەقام چاوەکانت گێڕا، هەریەك لە خەڵك و ئوتومبێل و درەخت. وەهەروەها باڵەخانە و شۆستە دەبینی. هەریەك لەو شتانەی کە دەیانبینی شوێنێك داگیر دەکەن. پێویستە شەقامەکە فراوان بن تا شوێنی هەموو شتێکی لەناودا هەبێ.

هەر شتێك دەبینی یان هەستی پێ بکەیت ماددەیە. **مادده** بریتییە لەهەر شتێك شوێنێك داگیر بکات. ئاو ماددەیە، هەروەها هەواو هەور ماددەن. تۆش ماددەی.

✔ مادده چییە؟

▼ هەر شتێك لەم وێنەیە مادده دەنوێنێ



لەبەرئەوەی مادده هەرشتێکە کە شوێنێك داگیر بکات، لەبەرئەوە نابێت دوو تەن هەمان شوێن لە هەمان کات داگیر بکەن. نموونە، ناکرێت ئاو بکرێتە ناو دەفرێك پڕی ئاو بێت. سەیری دەرەوەی پۆل بکە ئایا باران دەبارێت؟ ئایا خۆر هەڵاتووە؟ باران و خۆر دوو جۆری ماددەن. ئایا ڕەشەبا هەیە؟ هەوا ماددەیە، بەڵام نابینرێت. چۆن دەزانی کە هەوا ماددەیە؟ هەوا شوێنێك داگیر دەکات لەکاتی فوکردنی باڵۆنێك تۆ دەتوانی سەیری ئەو شتانە بکەیت کە هەوا دەیانجوڵێنێت وەك گەڵای رووەك یان کۆلارەیەك.

**✔ لەبەرچی هەوا بە مادده دەژمێرێت؟**




▲ ئاو بە تەواوی ئاو دەفرەکە داگیر دەکات، ناکرێ ئاوی دیکە بکرێتە سەری



▲ هەوا نابینرێت، بەڵام کۆلارە دەجوڵێنێت.

## هەستەکان و سیفەتەکانی ماددە

سیفەتی ماددە بریتییە لە هەر شتێك کە تێبینی بکەیت بە بەکارهێنانی یەکێك لە هەستەکانت یان زیاتر. ئەگەر هەستی بینینت بەکارهێنا بۆ بینینی جووجکەی مریشکێك، دەبینی کە قەبارەی بچووکە و رەنگی زەردە، تۆ پێوانەی جووجکەکە و رەنگەکە دەبینی. وە ئەگەر هەستی بیستنت بەکارهێنا دەنگی دەهۆڵ لەکاتی لێدانی دەبیستی، یان هاشەهاشی رەشەبالەکاتی هەڵ بوونی. یان دەنگی زەنگەکان لەکاتی لێدانیان.

وە ئەگەر هەستی بەرکەوتنت بەکارهێنا تێبینی پارچە سەهۆڵێك دەکەی کە سارد و لووس و سەختە. وە هەست دەکەین کە کاغەزی سمپارە زبرە. وە ئەگەر هەستی بۆنکردنت بەکارهێنا بۆنی خۆشی گوڵ و بۆنی بۆگەنی هێلکەی بۆگەن بوو هەست پیێ دەکەیت. وە ئەگەر هەستی تام کردنت بەکارهێنا، هەست بە شیرینی خۆراك یان سوێری یا تفتی دەکەیت.



جوجکەی مریشك بچووکە و رەنگی زەردە ◄



▲ سەهۆڵ سارد و سەختە



▲ گوڵ بۆنێکی خۆشی هەیە



▲ سێو لە دەرەوە لووسە و لە ناوەوە تامێکی شیرینی هەیە.

ڕەنگ و پێوان و شێوە و بەرکەوتن لە سیفەتەکانی ماددەن. مادده سیفەتی دیکەی هەیە، دەکرێت ببینی یان گوێت لێبێ یان هەستی پێ بکەیت. لاستیك بۆ نموونە لەو ماددانەیە کە لەکاتی کەوتنی بۆ سەرزەوی دەگەڕێتەوە، بەڵام شووشە لەو ماددانەیە کە دەشکێت ئەگەر کەوت.

وە لەوکاتەی کە بەستەری لاستیکی ڕادەکێشیت درێژی زیاتر دەبێت، بەڵام درێژی داوێکی خوری یان لە پەمۆ دروستکرابێ هەروەك خۆی دەمێنێت. زانراوە خوێ لە ناو ئاو دەتوێتەوە، بە پێچەوانەی لم. تۆڕێك کە لە کاغەز دروستکرابێ ئاسانی دەنووشتێتەو. بەڵام ڕاستەیەك کە لە پلاستیك دروستکرابێ بە ئاسانی دەشکێت لەکاتی نووشتانەوەی. موگناتیسەکان ئەو تەنانەی کە ئاسنیان تێدا بەرەو خۆیان ڕادەکێشن، وە تەنی دروستکراو لە مس ڕاناکێشن. ئەمانە هەمووی نموونەی زۆر کەمن لە سیفەتەکانی ماددە. بیر لە سیفەتی دیکە بکە بۆ ئەو ماددانەی کە لە ناو ژووری پۆلەکەت دەیانبینیت.

✔ **دوو سیفەت بۆ بەری مۆز بڵێ؟**



▲ زۆر لەو شتانەی کە دەکەونە سەر زەوی تێك دەشکێن لەوانە: شووشە



▲ دەکرێ تۆڕێك لە کاغەز دروست کرابێ بە ئاسانی بنووشتێتەوە.



◄ موگناتیس ئەو تەنانە ڕادەکێشێت کە لە ئاسن دروستکرابن.

## پێوانی مادده

مادده سیفەتێکی دیکەی هەیە ئەویش بارستاییە. **بارستایی** بریتییە لە بڕی مادده لە ناو شتێك. دەتوانی بارستایی بپێویت بە بەکارهێنانی تەرازووی دووتا. بارستایی بە یەکەی گرام یان کیلۆگرام دەپێورێت. هەر یەك کیلۆگرام یەکسانە بە ١٠٠٠ گرام.

گریمان پارچەیەکی بچووکت لە سێو هەیە و بارستاییەکەی دەزانی. وە هەروەها پارچەیەکی بچووك لە پرتەقاڵت هەیە و بارستاییەکەی دەزانیت هەردوو پارچەکان بەیەکەوەت تێکەڵ کرد بۆ دروستکردنی زەڵاتەی میوە. چۆن دەزانی بارستایی ئەم زەڵاتەیە چەندە بەبێ بەکارهێنانی تەرازوو؟ ئەگەر زانیت «هەردوو بارستاییەکان کە زانراون کۆیان بکەوە» وەڵامەکەت ڕاست دەبێ. کۆی بارستایی دوو شت یان زیاتر دەبێتە کۆی هەر بارستاییەك لەگەڵ ئەوی دیکەیان.



بارستایی ئۆتۆمبێلێکی یاریکردن ٥٠ گرامە

بارستایی مێوژ ١٤ گرامە



بارستایی ئۆتۆمبێلی یاریکردن و مێوژ دەکاتە ٦٤ گرام ئەویش کۆی بارستایی هەریەك لە ئۆتۆمبێلەکە و مێوژەکەیە

مادده سیفەتی دیکەی هەیە دەکرێ بپێورێت ئەویش قەبارەیە. زاناکان قەبارەی شتەکان دەپێون بە بەکارهێنانی کەلوپەلی تایبەت. شلە قەبارەی دەپێورێت بە پێوەر یان شووشەیەکی پلدار. **قەبارە** بریتییە لە بڕی ئەو شوێنەی کە مادده داگیری دەکات. قەبارەی شلەکان بە یەکەی ملیلتر یان لیتر دەپێورێت. لیتر یەکسانە بە ١٠٠٠ ملیلتر. لە چالاکی پێشوودا، ١٠٠ ملیلتر لە ئاوی ڕەنگاوڕەنگت پیوا. قەبارەی ئاوی ڕەنگاوڕەنگ لە پێوەرەکە ١٠٠ ملیلتر بوو.



هەریەک لە پێوەر و شووشەی پلەدار قەبارەی شلە دەپیوین بەیەکەی ملیلتر

✔ قەبارە چییە؟

لەناو هەر دەفرێکی پڕی ئەم دەفرانە هەمان قەبارە مادده هەیە. بە وردی سەیری ماددەکانی هەر دەفرێک بکە. هەر جۆرێک لەم ماددانە بارستاکەی جیاوازە. بارستایی نقوڵ گەورەترە لە بارستایی ماکەرۆنە. هەروەها بارستایی لم گەورەترە لە بارستایی هەڵمات.



نقوڵ ماکەرۆنە لم هەڵمات

## تەنەکان ژێرئاودەکەون و سەرئاو دەکەون

ئەگەر تەنێکت لە ناو ئاو دانا، دەبینی ئەو تەنە ژێرئاو دەکەوێ یان سەرئاو دەکەوێت.

**ژێرئاوکەوتن** تەنێکی ناو ئاو لەوکاتەی کە دەکەوێتە بنکی ئاوەکە. **سەرئاوکەوتن** تەنێکی سەر ئاو لەوکاتەی هەر لەسەر ئاو دەمێنێتەوە.

توانای سەرئاوکەوتن و ژێرئاوکەوتن لە سیفەتی تەنەکانە ئەگەر دار هەردەم سەرئاو دەکەوێت، بەڵام ئاسن ژێر ئاو دەکەوێ وە هەندێجاریش سەرئاو دەکەوێت. بزمارێکی ئاسن لەناو ئاو دابنێ دەبینی ژێر ئاو دەکەوێت، بەڵام پاپۆڕێکی دروستکراو لە ئاسن سەرئاو دەکەوێت. وە بۆ ئەوەی بزانین کام تەن سەرئاو دەکەوێت و کام تەن ژێر ئاو دەکەوێت پێویستە تاقیکردنەوە بکەین.

✔ **چۆن دەزانین کە تەنێك سەرئاو دەکەوێ؟**



## پوختە

ماددە بریتییە لەهەر شتێك شوێنێك داگیر بکات.

ماددە سیفەتی هەیە وەك رەنگ و شێوە و بەرکەوتن و تامکردن و بۆن و سەرئاوکەوتن و ژێرئاوکەوتنی.

دەکرێ تێبینی ماددە بەکرێت بە بەکارهێنانی هەستەکان.

بارستایی و قەبارە دوو سیفەتی ماددەن و دەپێورێن. بارستایی بریتییە لە بڕی ماددە لەناو تەنێك. وە قەبارە بریتییە لە ئەو شوێنەی کە تەنێك داگیری دەکات.

## پێداچوونەوە

١. ماددە چییە؟

٢. بارستایی چییە؟

٣. چۆن سیفەتەکانی ماددە دەزانین؟

٤. دوو جۆر لە میوە دیاربکە. کام لەم دوو میوەیە بارستایی بەرەکەی زیاترە لەوەی دیکە؟ روونی بکەرەوە.

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** کام لەم کۆمەڵە ووشانە لە سیفەتەکانی ماددەن؟

أ رەق ، شل، گازی.

ب سەهۆڵ ، شلە ، هەڵمی ئاو.

ج سەخت ، لووس ، دەکرێ بشکێ.

د تاوێرەکان، بەردی گران بەها، سەرئاو دەکەوێت.



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### پێوانی قەبارە

بڕێك ئاو بکە ناو دەفرێکی پلاستیکی روونەوە. پاشان دەمەوانەکەی دابخە، ئاستی بەرزایی ئاوی ناو دەفرەکە (ئامانەکە) بپێوە دەفرەکە بخە ناو بەفرگرەوە دوای سێ کاتژمێر ئاستی سەهۆڵ لە دەفرەکەدا بپێوە قەبارەی ئاوەکە چی بەسەرهاتووە؟

پەیوەندی لە نێوان ئەو بارەی بەسەر ئاوەکە و قەبارەکەدا هات چییە؟



بەستنەوە بە نووسین

### راڤەکردن

گریمان تۆ چوویت بۆ کڕینی سەوزە، لەلای فرۆشیار پێوەری بارستایی نەبوو. چیرۆکێك بنووسە لەسەر ئەو شتەی کە ئەنجامی دەدەیت بۆ ئەو سەوزەیەی کە پێویستە و بیکڕێت.

وانەی ٢

# چۆن مادده دەگۆڕێت؟



لێدەكۆڵمەوە

## جیاكردنەوەی تێكەڵ

**ئامانجی چالاكییەكە** لە تێكەڵی لم و سەدەف و وردە چیلكە و چەودا. دەتوانی بە ئاسانی سەدەف بە دەست جیابكەیتەوە. بۆ ئەوەی پێكهاتەكانی تێكەڵەیەك جیابكەیتەوە. پێویستت بە ڕێگەو ئامێری تر دەبێت. نەخشەی (پلانی) لێكۆڵینەوەیەك و جێبەجێ كردنی دابڕێژە بۆ دۆزینەوەی ڕێگاكانی جیاكردنەوەی پێكهێنەكانی تێكەڵێك.

### كەرەستەكان

- ٤ كوپی پلاستیكی ڕوون
- ئاو
- برنج
- پێوەر
- ڕەحەتیی
- ٦ تۆپی شووشە (هەڵمات)(كەلای شوشە)
- تەلی كاغەزگری پۆلایی
- موگناتیس
- دەستە سڕی كاغەز

### هەنگاوەكانی چالاكییەكە

1. تێكەڵێك لەئاو و تۆپی شووشە لەكووپێكدا ئامادە بكە. نەخشەی ڕێگایەك دابنێ بۆ جیا كردنەوەی تۆپە شووشەكان لە ئاوەكە وە پاشان تاقی بكەوە. هەنگاوەكانت لەگەڵ ئەنجامەكەی تۆماربكە.



چەرەزات تێكەڵێكە لە فستق و بندق و باوی و نۆك جۆرەكانی هەر ماددەیەك لەم پێكهاتەیەدا ناگۆڕێت دوای تێكەڵكردنیان



٢ لە دەفرێکدا تیکەڵێکی تۆپی شووشە و تەلی کاغەز گر و برنج ئامادەبکە. نەخشەرێگایەك دابنێ بۆ جیاکردنەوەی پێکهاتەکانی تێکەڵەکە پاشان تاقی بکەوە هەنگاوەکان و ئەنجام بنووسە.

٣ ئەگەر هەنگاوەکانت سەرکەوتوو نەبوو، ئەوا پلانی ڕێگایەکی تر دابرێژە بۆ جیاکردنەوەی پێکهاتەی تێکەڵەکەت، هەوڵی ڕێگەی تر بدە تاسەردەکەوێت بەهۆی بەکارهێنانی موگناتیسەوە. هەموو ئەو ڕێگایانە تۆماربکە کە تاقییان دەکەیتەوە.

٤ چواریەکی کوپێك برنج لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بکە ( لە ناو کوپێکی تردا) چۆن برنجەکە لە ئاوەکە جیا دەکەیتەوە ؟ بیرۆکەکەت بنووسە .

٥ پاڵێویێك بە بەکارهێنانی دەستەسڕی کاغەزو کوفکێك دروست بکە . پێشبینی بکە چۆن ئەم ئامێرە بەکاردەهێنین بۆ جیا کردنەوەی تێکەڵەیەك . پاڵێوەکە بەکاربهێنە بۆ جیاکردنەوەی تێکەڵەیەك (وێنەی أ) .

کارامەییە | کردەییەکانی | زانست

زاناکان دەربارەی جیهانی دەوروبەریان دەپرسن تا وەڵامەکانیان دەست بکەوێت. زاناکان گریمان دادەنێن . پاشان نەخشەی تاقیکردنەوەکان دادەرێژن، وە جێبەجێ دەکا تاکو دڵنیا بن لەو گریمانە . زۆر جار گریمانەکانیان ڕاست نین ، کاتێ ئەمە ڕوودەدات ، زاناکان گریمانەکانیان و تاقیکردنەوەکانیان دووبارە دەکەنەوە. تاکو ڕاستیی گریمانە نوێییەکان دەست دەخەن.

## دەرئەنجام بکە

١. لەچی کاتێکدا بەکارهێنانی دەست بەسە بۆ جیاکردنەوەی پێکهاتووەکانی تێکەڵە ؟

٢. کەی پێویستت بە ئامێر دەبێ بۆ جیاکردنەوەی پێکهاتەی تێکەڵە؟

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن** زۆر جار زاناکان خشتەکان بەکاردەهێنن بۆ **تۆمارکردنی** ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان . چۆن خشتەکان یارمەتیت دەدەن لە نەخشەدانانی لێکۆڵینەوەکان و لە بەجێ هێنانیاندا؟



فێردەبم

# دوو جۆرە گۆڕانەکانی مادده

بناسە
- چۆن مادده دەگۆڕێ و ئەو ماددەیە وەکو خۆی دەمێنێتەوە.
- گیراوە و تێکەڵ.
- چۆن جۆری نوێ لە مادده دروست دەبێ.

## زاراوەکان
تێکەڵ
گیراوە

## گۆڕانکاری کە نابێتە هۆی دروستبوونی ماددەی نوێ

کاتێك جلەکانت دەشۆی ، تەڕو سابوناوی و چرچ و لۆچ دەبێت ،لەگەڵ ئەم هەموو گۆڕانەدا جلەکانت هەر جلەکانی جارانە. هەندێك گۆڕان وا لە تەنەکان دەکات وا دەرکەون کە زۆر جیاوازن ، دەتوانین کاغەز پارچە پارچە بکەین و ڕەنگی بکەین، شتی لەسەر بنوسین و بیلکێنین ، لە هەموو جارێکدا کاغەزەکان جیاواز دەردەکەون ، بەڵام هەر بە کاغەزی دەمێنێتەوە

زانراوە گۆڕانی پلەی گەرمیی دەبێتە هۆی گۆڕانی سەهۆڵ بۆ ئاو. ساردکردنەوەی ئاو دەیگۆڕێت بۆ سەهۆڵ. هەڵمی ئاو و ئاو و سەهۆڵ هەر هەموویان هەمان ماددەن، بەڵام جۆری تری ماددەیان دروست نەکردووە.

بڕینی خوری لە مەڕومالات، لە دوایدا دروستکردنی داو لەم خوریە و چنینی ئەم داوانە دەبنە جلوبەرگی خوری، نموونەی ئەم جۆرە گۆڕانکاریانەن. شێوەی خوریەکە دەگۆڕێت، بەڵام هەر خوریە واتە هەمان ماددەی پێشوو.

✔ هەندێ لە گۆڕانکاریەکانی مادده بڵێ لەگەڵ مانەوەی ماددەکە وەك خۆی؟

لەسەر پێستی بەرخ پۆشەرێکی خوری گەشە دەکات ▼



خوری دوای چنینی دەبێتە داو ◄

## تێکەڵ

**تێکەڵ** بریتییە لەوەی دوو مادە یان زیاتری تێدایە. لەکاتی دروستکردنیان تێکەڵ گۆڕانکاریان بەسەردانایەت، وەك گۆڕینی شێوە یان تامەکەیان، تۆ ماددەی جیاواز بەیەکەوە دادەنێیت، بەڵام ماددەی نوێ دروست ناکەیت.

دەکرێ جۆرەکانی ماددەی جیاواز لە تێکەڵێك جیابکرێنەوە. دوای جیاکردنەوەی پێکهاتەکانی تێکەڵەکە، وە هەر ماددەیەك دەگەڕێتەوە وەك خۆی پێش تێکەڵکردنیان. لە چالاکی پێشوودا تێکەڵێك لە برنج و تەلی کاغەز گر و تۆپە شووشەت دروستکرد.

لە دواییدا ئەم تێکەڵەت جیاکردەوە بۆ برنج و کۆمەڵێك تەلی کاغەزگر و تۆپە شووشەکان. دەکرێ هەندێ جۆر تێکەڵ لەیەکتر جیابکرێتەوە بە بەکارهێنانی دەستەکانەوە. تۆ برنج لە تۆپە شووشەکانت جیاکردەوە تەنها بە بەکارهێنانی دەستەکانت. دەکرێ هەندێ جۆری تێکەڵ پێکهاتەکانی لێك جیابکرێتەوە بە هەڵمبوون یان چڕبوونەوە. لە کرداری هەڵمیندا، ئەو بەشەی کە شلە لە تێکەڵەکە جیادەبێتەوە بە شێوەی گاز، وە بەشەکانی دیکە دەمێنێتەوە. وە لە کرداری چڕبوونەوەدا ئەو بەشەی کە لە شێوەی گازدایە لە پێکهاتەی تێکەڵەکە دەگۆڕێت بۆ شل.
کەواتە دەکرێ شلەیەك لە یەکێکی دیکە جیابکرێتەوە.

✔ تێکەڵ چییە ؟



ئەم قاپە تێکەڵەیەکی پەنیر و زەیتوون و تەماتە و سەوزەی دیکەی تێدایە. هەرماددەیەك وەك خۆی ماوەتەوە. دەکرێ جیابکرێنەوە دوایی تێکەڵکردنیان ◄

## گیراوەکان

ئایا پێشتر شەکرت کردۆتە چایەوە؟ دوای تێکدانی چایەکە ناتوانیت شەکر ببینیت، بەڵام دەزانیت کە هێشتا شەکرەکە هەیە چونکە لە تامکردندا هەستی پێ دەکەیت، ئەم تێکەڵەیە لەشەکر و ئاو پێ ی دەوترێت **گیراوە** تەنۆکەکانی مادده جۆراوجۆرەکان بەشێوەیەکی ڕێك وپێك تێکەڵ دەبن.

ناتوانرێ بە بەکار هێنانی هەردوو دەست جۆرە جیاکانی مادده لە گیراوەدا جیا بکرێتەوە ، بەڵام هەڵمین هەندێك گیراوە لە یەکتر جیادەکاتەوە، ئەگەر چاییت گەرم کرد ویان کوپەکەت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە دەرەوە دانا، ئاوەکە لە چایەکەدایە دەبێتە هەڵم و شەکرەکە دەمێنێتەوە.

✔ **گیراوە چییە؟**

شەربەتی لیمۆ گیراوەیەکە لە ئاو و گوشاوی لەیموونی ترش و شەکر پێکهاتووە ▼



## گۆڕانکاری ماددەی نوێ دروست دەکەن

گۆڕانکاری دیکە هەیە دەبێتە هۆی دروستبوونی ماددەی نوێ.

**چێشت لێنان** دەبێتە هۆی دروستبوونی ماددەی نوێ. لەوکاتەی ئارد و هێلکە و شیر و زەیت دەگۆڕێن بۆ کێك. ماددەی نوێ دروست دەبێ. کێك ناگۆڕێت بۆ ئارد و هێلکە و شیر و زەیت جارێکی دیکە.

**سووتان** بریتییە لە سووتانی شتێك و گڕگرتنی ئاگر تیایدا. ڕۆژانە خەڵك زۆر شت دەسووتێنێت. بۆ نموونە: گازی شل دەسوتێت لەکاتی چێشت لێنان. هەروەها بزوێنەرەکانی ئۆتۆمبێلەکان و بارهەڵگرەکان بانزین وەك سوتێنەر دەسوتێنن بۆ ئەوەی بجووڵێن. لەکاتی سووتانی شتەکان، جۆری نوێ و جیاواز لە مادده پەیدا دەبن. لەکاتی سووتانی دار، ماددەیەکی نوێ پەیدادەبێت کە لە دوکەڵ و خۆڵەمێشی تێدایە. وە ناکرێت دوکەڵ و خۆڵەمێش بگەڕێنەوە بۆ دار جارێکی دیکە.

کاتی دروستکردنی نان لە فڕنیدا ماددەی نوێ دروست دەبێت. ▼





لەکاتی سووتانی دار جۆری جیاواز لە مادده پەیدادەبێت لەوانە: خۆڵەمێش. خۆڵەمێش بە دار ناچێت. ▼



**ژەنگ** ئەگەر پارچە ئاسنێك لەبەر هەوای شێدار دانا ، دوای ماوەیەك چەند پەڵەیەكی ڕەنگ قاوەیی لەسەر پەیدا دەبێت ئەو مادده قاوەییە بریتییە لە ژەنگ.

ژەنگ ماددەیەكی جیاوازە لە ئاسن ، وەك ئاسن توند نییە. لەوكاتەی ئاسن ژەنگ دەگرێت، بەشێك لە توندییەكەی وون دەكاتەوە، لە توانات دا هەیە لە هەر كاتێك ژەنگ لابەریت.

✔ **دوو نموونە بۆ گۆڕانی مادده بهێنە كە ماددەی نوێیان لێ پەیدادەبێت.**

بورغوی نوێ بریقەدارە، ئەگەرچی بورغوەكانی تر كۆنن، ئاسن لە بورغوە كۆنەكاندا لەوانەیە ژەنگ بێنێت، كە ئەم ئاسنە لەگەڵ ئاو و هەوا یەكیان گرتووە بۆ پێكهێنانی ماددەیەكی نوێ كە پێی دەڵێن (ژەنگ). ▼



## پوخته

دەتوانین قەبارە و شێوە و دۆخی ماددە بگۆڕین ، دەتوانین ماددەکان تێکەڵ بکەین، بەگۆڕانی ئەو ماددەیە نابێتە هۆی پەیدابوونی ماددەی نوێ.

تێکەڵ، دووجۆر یان زیاتر لە ماددەی تێدایە دەکرێ لێك جیابکرێنەوە. گیراوە ، جۆرێکە لە جۆرەکانی تێکەڵ لە گیراوەدا ، تەنۆکە جیاوازەکانی ماددە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك تێکەڵ دەبن. هەندێ لە گۆڕانەکان، وەك سووتان و ژەنگ و چێشت لێنان دەبنە هۆی پەیدابوونی ماددەی نوێ.

## پێداچوونەوە

١. سێ گۆڕانکاری بڵێ کە تیایاندا گۆڕان نابێتە هۆی پەیدابوونی ماددەی نوێ.

٢. جیاوازی لە نێوان تێکەڵ و گیراوە دا چییە ؟

٣. دوو گۆڕانی زانراو بڵێ کە دەبنە هۆی پەیدابوونی ماددەی نوێ.

٤. گریمان گیراوەیەکی ئاو و خوێت لەلا هەیە، تۆ ڕێگای بە هەڵمبوون بەکاردەهێنیت بۆ جیاکردنەوەی ئاو لە خوێ. ئاو بۆ کوێ دەچێت؟

٥. ئامادەکاریی بۆ تاقیکردنەوە کام لەمانەی خوارەوە گیراوەیە ؟

أ تۆپە شووشە تێکەڵاوەکان .

ب شەکری بە ئاو تێکەڵکراو.

ج قوڕ و تاوێر و چیلکە بچووکەکان .

د تێکەڵەی برنج و ئاو .


تێکەڵ



## بەستنەوەکان



### شیکاری پرسێك

بۆ ئامادە کردنی لیترێك خۆشاوی لیمۆ پێویستمان بە پەرداخێك ئاوی لیمۆ ، ٤ پەرداخ ئاو هەیە .

چەند پەرداخ ئاو پێویستە بۆ ئامادەکردنی سێ لیتر خۆشاوی لیمۆ ؟



### دەرهێنانی خوێ

لەهەندێ وڵات خوێ لە ئاوی دەریا سوێرەکان دەردەهێنرێت. دەزانی چۆن گیراوەیەکی خوێاو لێك جیادەکرێتەوە، بۆ بەدەستهێنانی خوێ؟

## بەندی ١ پێداچوونەوەو ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

### پێداچوونەوەی زاراوەکان

ئەو زاراوانەی خوارەوە بەکاربهێنە بۆ تەواو کردنی ڕستەکان لە ١ تا ٦ ژمارەی لاپەڕەکەی تۆمارکراو لە نێوان( ). شوێنی بوونی زانیارییەکان لە بەندەکەدا نیشان دەدات کە لەوانەیە پێویست پێیان هەبێت .

| | |
|---|---|
| مادده (١٤٨) | سەر ئاو دەکەوێ (١٥٤) |
| بارستایی (١٥٢) | تێکەڵ (١٥٩) |
| قەبارە (١٥٣) | گیراوە (١٦٠) |
| ژێرئاو دەکەوێ (١٥٤) | |

١. ـــــــ ئەو ماددەیەکە دوو شت یان چەند شتێکی تێدایە ودەتوانرێت جیا بکرێتەوە .

٢. ـــــــ تەنێك لەوکاتەی ژێرئاو دەکەوێت.

٣. ـــــــ تەنێك لەوکاتەی لەسەرئاو دەمێنێتەوە.

٤. ـــــــ تێکەڵێکە کە تێیدا تەنۆلکەکانی هەمەچەشنە ماددەکانی بە شێوەیەکی ڕێك تێکەڵ دەکرێن .

٥. ـــــــ بڕێکی مادده لەناو شتێك.

٦. ـــــــ هەر شتێك کە شوێنێك داگیر بکات.

### بەستنەوەی چەمکەکان

ئەم شێوەیەی خوارەوە تەواوبکە بە هێنانی سێ نموونە لەسەر گۆڕانەکان کە ماددەی نوێ پەیدا نابێت وە دوو نموونە لەسەر گۆڕانەکان کە دەبنە هۆی پەیدابوونی ماددەی نوێ. دەربڕینەکانی پێویست بنووسە بۆ تەواو کردنی نەخشەی چەمکەکان .



## دڵنیا بوون لە تێگەیشتن

پیتی گونجاو بازنەدار بکە:

١. کام لەوانەی خوارەوە ماددەی نوێ دروست دەکات؟

أ تووانەوەی سابوون لە ئاودا.

ب بڕینی کاغەزێك بە مەقەست.

ج سووتاندنی کاغەز.

د باڵۆن پڕبکەیت لەهەوا.

٢. کام لەمانەی خوارەوە ماددەی نوێ دروست ناکات؟

أ تێکەڵکردنی دەنکە ترێ و شلیك و توو.

ب ژەنگی سەر ئاسنی ئوتومبێل.

ج سووتانی پارچە دارێك.

د برژاندنی نانێك.

٣. یەکێك لە سیفەتە هاوبەشەکانی نێوان تۆپێکی پێ و تۆپێکی تێنسی سەر زەوی ئەوەیە ؟

أ هەمان ڕەنگیان هەیە.

ب هەمان قەبارەیان هەیە.

ج هەمان بارستاییان هەیە.

د لەکاتی بەرکەوتنیان بەر شتێك دەگەڕێتەوە.

٤. کام لەمانەی خوارەوە گیراوەیە ؟

أ لق و گەڵای ڕووەك و مێرووەکان.

ب شەکرو ئاو.

ج ڕۆژنامەو گۆڤار.

د شیر و دانەوێڵە بۆ خواردنی بەیانی.

٥. چی جۆرە ماددەیەك پەیدا دەبێت لەکاتی سووتانی دارێك؟

أ دار.

ب هەور.

ج ژەنگ.

د خۆڵەمێش

٦. کام لەم سیفەتانە، سیفەتی ئاسنن؟

أ توانای شکاندنی هەیە.

ب موگناتیس رایدەکێشێت.

ج دەگەڕێتەوە لەکاتی بەرکەوتنی بەر تەنێك.

د تازەیە.

وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە:

٧. گریمان تۆ بیورێکت لەژێر باران جێهێشتووە. دوایی دوو هەفتە پەڵەی قاوەیی لەسەری پەیدادەبن. باسی بکە چی ڕوویدا؟

## پێداچوونەوەی کارامەییە کردەکانی زانست

بە (ڕاست) یان (چەوت) وەڵام بدەوە ئەگەر دەقەکە چەوت بوو ئەوا ئەو وشانە کە هێڵی بە ژێردا هاتووە بگۆڕە بۆ ڕاستییەکەی :

١. زانایەك دەیەوێت وەڵامی پرسیارێك بداتەوە پلان بۆ لێکۆڵینەوەیەك دادەنێ و جێبەجێی دەکات.

٢. لەوکاتەی کە پێشبینی دەکەیت ئەو شتەی کە لە پێشدا ڕوویداوە ڕوونی دەکەیتەوە.

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

### تێکەڵ و گیراوە

لەگەڵ سێ یا چوار قوتابی کاربکە .

مامۆستایەکەت ئەم شتانەت بۆ دابین دەکات، مەسینەیەك ئاو، دوو پەرداخ، تەلی کاغەز گر. دەرزی بێ زیان، خوێ، کەوچك، گەنمەشامی. تێکەڵێك و گیراوەیەك دروست بکە و ناونیشانێك بۆ هەر یەکەیان دابنێ.

## بەندی ٢

# گەرمی

لە ڕۆژێکی سارد و خۆراوی چی دەکەیت بۆ ئەوەی هەست بە گەرمی بکەیت؟ لەوانەیە لە ژێر تیشکی خۆر بووەستیت یان جلوبەرگی خوری لەبەربکەیت یان لە نزیک گەرم کەرێك دابنیشی. لەهەریەك لەم بارانەدا هەست بە گەرمی دەکەیت یان پارێزگاری لێدەکەیت.

### زاراوەکان

گەرمی
پلەی گەرمی
گەمی پێو
گەیاندن
گەیێنەر
نەگەیێنەر

### زانیارییەکی خێرا

خێرایی دەنگ لە هەوادا بە زیادبوونی پلەی گەرمی زیاد دەکات. ئەم خشتەیەی خوارەوە خێرای دەنگ لە پلە گەرمییە جیاجیاکاندا دەردەخات.

خێرایی دەنگ لە هەوادا

| پلەی گەرمی $^{o}C$ | خێرای دەنگ مەتر/چرکە |
|---|---|
| ٠ | ٣٣٢ |
| ٥ | ٣٣٥ |
| ١٥ | ٣٤١ |
| ٢٥ | ٣٤٧ |
| ٤٠ | ٣٥٦ |

## زانیارییەکی خێرا

گەرمی زۆر بەکارهێنانی خۆشی هەیە.
ئەو باڵۆنانەی بە هەوای گەرمکراو کاردەکەن، دەفڕن. چونکە هەوای گەرم لە هەوای سارد سوکترە و بەرەو ژوور دەردەچێ. ساڵی ١٧٨٣، یەکەم باڵۆن بەردرا، کەمرۆڤی تێدانەبوو، بەڵکو مەڕێك وکەڵە شێرێك و مراوییەکی تێدابوو.

وانەی ١

# گەرمی چییە؟

لەم وانەیەدا

لێدەکۆڵینەوە

فێردەبیت

دەربارەی گەرمی و پلەی گەرمی

## لێدەکۆڵمەوە

# لێکخشاندنی تەنەکان لەیەکتری

**ئامانجی چالاکییەکە** زاناکان ئەوەی دەیزانن بەکاری دەهێنن بۆ خستنەڕووی بیرۆکەکان دەربارەی ڕێگای کارکردنی جیهانی دەوروبەرمان، پاشان تاقیکردنەوەکان ئەنجامدەدەن بۆ دڵنیا بوون لە ڕاستی بیرۆکە کانیان، بەو بیرۆکە تاقیکراوانە دەڵێن **گریمانەکان**. لەم چالاکییەدا دا گریمانە دادەنێت دەربارەی گەرمی.

### کەرەستەکان

- قۆپچەی کانزایی.
- کاغەزێك
- پارچە خورییەکی بچووك
- پارچەدراوی کانزای.

---

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ هەردوو دەستت تێکهەڵکێشە و بەیەکیانەوە بنووسێنە، ئایا هەست بەساردی یان بەگەرمی دەکەیت لەدەستەکانتدا؟ **تێبینیەکانت تۆماربکە**.

٢ **گریمان دابنێ** هەست بەچی دەکەی ئەگەر لەپی دەستێکت لە بەری دەستەکەی ترت خشاند؟ تۆمار بکە.

وەستانت لە نزیك مقاڵی گۆشت برژاندن، هەستی گەرمیت دەداتێ، گەرمی لە خەڵووزەکەوە دەست پێ دەکات. پاشان لاتەنیشتەکانی مقاڵیەکە گەرم دەبێت. کاتێك کە ئاگرەکە ئامادە دەبێت بۆ برژاندن،هەموو بەشەکانی مقاڵیەکە گەرم دەبێت.



وێنەی أ



وێنەی ب

٣ هەردوو لەپی دەستت بۆ ماوەی ١٠ چرکە بە خێرایی لێك بخشێنە،ئەوەی دەیبینی **تۆماری** بکە.(وێنەی أ)

٤ هەست بەچی دەکەی ئەگەر قۆپچەیەك لە خوری بخشێنیت؟ هەست بە چی دەکەی ئەگەر پارچە دراوێکی کانزات لە کا غەز خشاند؟ گریمان دابنێ بۆ هەر تاقیکردنەوەیەك و **تۆماری** بکە.

٥ بۆ ماوەی (١٠) چرکە قۆپچەیەك لە خوری بخشێنە. دەستیش لە قۆپچە کە بدە.پاشان خوریەکە بگرە. ئەوەی دەیبینی **تۆماری** بکە (وێنەی ب).

٦ پاشان ئەم پارچە دراوە کانزاییە لە پارچە کاغەزێك بخشێنە بۆ ماوەی (١٠)چرکە.دەست لە پارچە کانزاکە بدە ئنجا دەست لە پارچە کاغەزەکەش بدە. ئەوەی دەیبینی **تۆماری** بکە.

کارامەییە کردەییەکانی زانست

لەکاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو بە ڕێکخستنی گۆڕاوەکان گریمانەکە تاقیدەکرێتەوە. بەمە دەوترێت (تاقیکردنەوەی کۆنترۆڵکراو)

## دەرئەنجام بکە

١. ئەو گۆڕانانە چین کە تێبینیت کرد؟ ئەو کردارانە چین کە بەجێت هێناوە و بوونەهۆی ئەو گۆڕانەی تێبینیت کرد؟

٢. ئایا گریمانەکانت ڕاست بوون؟ ئەگەر ڕاست نەبوون،چۆن دەتوانی بیان گۆڕیت. بەپشت بەستن بەوەی کە فێری بوویت؟

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن.** زاناکان زانیارییەکان و تاقیکردنەوەکانیان بە کاردەهێنن تا یارمەتیان بدەن لە دانانی گریمانەکان.ئەو زانیاری و تاقیکردنەوانەی سەرنجتدان لەم چالاکییەدا و یارمەتییان دایت لە دانانی گریمانەکەتدا کامانەن؟



## فێردەبم

# گەرمی

بناسە
- گەرمی
- چۆن گەرمی بەرهەم دێت و چۆن بەکاردەهێنرێت
- پلەی گەرمی چۆن دەپێورێت.

زاراوەکان

گەرمی

پلەی گەرمی

گەرمی پێو

### گەرمی و چۆنیەتی پەیدابوونی

**گەرمی** جۆرێکە لە وزە، توانای گەرم کردنی ماددەکانی دیکەی هەیە، لە رۆژێکی سامالّدا هەست بە گەرمی دەکەیت کە لە خۆرەوە دێت. گەرمی خۆر خاک و ئاو و هەواو زیندەوەرەکان گەرم دەکات.

لە چالاکی پێشوو زانیت کە لەکاتی لێکخشاندنی تەنێك بە تەنێکی دیکە لە ئەنجامدا گەرمی بەرهەم دێت، وە وادەکات تەنەکان گەرمتربن. مرۆڤ لە ئەنجامی سووتاندنی گەرمی بەرهەم دێنین. نەوت و گازی سرووشتی و دار جۆری سووتەمەنین. هەر جۆرێکی سووتەمەنی لەکاتی سووتاندنی گەرمی پەیدادەکات.

✔ گەرمی چییە؟

لەکاتی لێکخشاندنی هەر دوو دەستەکان هەست بە گەرمی دەکەین ▼



گەرمی هاتوو لە خۆرەوە بۆ سەر زەوی هەموو شتەکانی سەرزەوی گەرم دەکات ▼





▲ گەرمی پەیدابوو لە کارەبا بەکاردێت بۆ چێشت لێنان

## وزەی گەرمی

مرۆڤ نەوت و گازی سرووشتی دەسوتێنێت بۆ گەرمکردنەوەی ماڵەکان و قوتابخانەوە و خانووبەرەی دیکە. هەروەها گازی سرووشتی بەکاردەهێنرێت بۆ چێشت لێنان.

دەزانین کەوا دار بە ئاسانی دەسوتێت. بۆیە ئاگر لە دارستانەکان دەکەوێت، ئەگەر مرۆڤ ئاگادار نەبێت. هەروەها مرۆڤ هەندێجار داروتەختە دەسوتێنێت بۆ گەرمکردنی ماڵەکانیان و بۆ چێشت لێنان. وە گەرمی پەیدابوو لە کارەبا بەکاردێت بۆ گەرمکردنی ماڵ و گەرمکردنی ئاو و چێشت لێنان.

✔ چۆن مرۆڤ گەرمی بەرهەم دێنێ؟

گازی سرووشتی بەکاردێت بۆ چێشت لێنان ▼

دار بە ئاسانی دەسوتێت ▼

## پلەی گەرمی

پلەی گەرمی پێوانی گەرمی یان ساردی شتێك، بەڵام گەرمی پێو بریتییە لە ئامێرێك بەکاردێت بۆ پێوانی پلەی گەرمی شتێك. لەسەر گەرمی پێو ژمارە چاپ کراوە، هەروەك ئەوەی لە راستەدایە. وە پلەی گەرمی بە یەکەی سیلیزی ( °C ) یان سەدی دەپێورێت.

بەمەش دەکرێ گەرمی هەوا یان خۆراك یا لەشت بپیوێت.

شتە گەرمەکان پلەی گەرمی بەرزیان هەیە، وە پلەی گەرمی نزم بۆ شتە ساردەکان.

پلەی گەرمی گڕی گازی سروشتی دەگاتە ٦٦٠س° ( °C )، وە پلەی گەرمی ئاو لە کاتی کوڵانی دەگاتە ١٠٠س° ( °C ) بەڵام پلەی گەرمی ئاو لەو کاتەی کە دەبەستێ یان شل دەبێتەوە ٠ س°.

✔ بۆچی مرۆڤ پێوەری گەرمی بەکاردەهێنن؟




زۆربەی گەرمیپێوەکان شلەیەك لەناو شووشەکانیاندا هەیە. دەتوانی ژمارەکانی سەر پێوەری گەرمی ببینی، ئەم ژمارانە بریتین لە پێوەری سیلیزی. واتە، پێوەری سەدی °C .





پێوەرێکی گەرمی ژمارەیی

## پوختە

گەرمی شتێکە کەوا دەکات شتەکانی دیکە گەرم ببن. مۆڤ گەرمی بەرهەم دێنێ لەکاتی سووتاندنی جۆری جیاواز لە سووتەمەنی، لە کارەباوە. گەرمی بەکاردێت بۆ گەرم کردنی ماڵەکان و بۆ چێشت لێنان و گەرم کردنی ئاو. وە پلەی گەرمی پێوەرێکە بۆ زانینی گەرمی یان ساردی شتێك. گەرمی پێو بەکاردێت بۆ پێوانی پلەی گەرمی.

## پێداچوونەوە

١. وزەی گەرمی چی لەماددە دەکات؟

٢. دوو ڕێگای بەکارهێنانی وزەی گەرمی بڵێ.

٣. دوو ڕێگای بەرهەم هێنانی گەرمی بڵێ.

٤. گرنگی چییە لە زانینی پلەی گەرمی هەوای دەرەوەی ماڵ؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** چی بەکاردەهێنی بۆ پێوانی پلەی گەرمی؟

أ لێکخشان

ب پلەی گەرمی

ج گەرمی پێو

د تەلەکان.



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### جیاوازی لە نێوان دوو پلەی گەرمی بدۆزەرەوە

هەویر لە پلەی گەرمی ٢٠٠ س° بە ١٥ خولەك دەبێتە نان بەڵام لە پلەی گەرمی ١٨٠ س° بە ٤٥ خولەك دەبێتە نان. جیاوازی نێوان ئەم دوو پلە گەرمییە چییە؟



بەستنەوە بە دروستی

### گەرم کردن

مرۆڤ لە کۆنەوە تووك و خوری بەکارهێناوە بۆ گەرمکردن. ناوی چوار ئاژەڵ بڵێ کە خوری و تووکیان لێ وەردەگرین؟

وانەی ٢

# گەرمی چۆن دەگوێزرێتەوە؟

لەم وانەیەدا

**لێدەکۆڵیتەوە**
کام جۆر لە تەنەکان زیاتر گەرم دەبێت

**فێردەبیت**
ڕێگایەك بۆ گواستنەوەی گەرمی.

**زانستەکان**
لەبەستیتەوە بە بیرکاری و دروستی.

## لێدەکۆڵمەوە

# چی گەرم دەبێت

**ئامانجی چالاکییەکە** کاتێك بچووك بوویت، فێربووی دەست لە ئاگردان نەدەیت،دەبوایە فێری ئەو وانەیە ببی، تاکو سەلامەت بیت. ئێستا دوای ئەوەی گەورەبووی دەتوانی جۆری ئەو شتانە بناسیتەوە کە گەرم دەبن و ئەو شتانەی کە هەرگیز گەرم نابن، تاقیکردنەوەیەك جێبەجێبکە بۆ زانینی ئەوە.

### کەرەستەکان:

- کەوچکێکی دار.
- کەوچکێکی کانزایی
- کەوچکێکی پلاستیکی
- ئاوی گەرم
- ٣ کوپی پلاستییك
- کوپێکی پلاستیکی دەسکدار
- کوپێکی گڵجۆشی دەسکدار
- کوپێکی کانزایی دەسکدار

وریابە ٥

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١. دەست لە سێ کەوچکەکە بدە، ئایا گەرمن یان ساردن؟ ئەوەی تێبینی دەکەیت تۆماری بکە.

٢. **وریابە** لەکاتی بەکار هێنانی ئاوی گەرمدا وریابە دەستت نەسووتێ. سێ کوپە پلاستیکەکە پڕبکە لە ئاوی گەرم،کوپەکان لە بەر دەمت لەسەر مێزێك دابنێ، کەوچکێك بخەرە ناو هەر یەکە لە کوپەکانەوە. یەك خولەك چاوەڕێ بکە.



گەرمی لە گەرم کەرەکە دەگوازرێتەوە بۆ دەفری کانزایی وە لەوێشەوە بۆ ئەو خواردنەی کە گەرم دەکرێت یان لێدەنرێت

| کەوچکەکان | | |
|---|---|---|
| دار | پلاستیك | کانزا |
| | | |

| کوپەکان | | |
|---|---|---|
| گڵجۆش | پلاستیك | کانزا |
| | | |



وێنەی أ



وێنەی ب

٣ به هێواشی دەست لە هەریەك لە کەوچکەکان بدە کامیان گەرم تر بووە؟ بڕی گەرمی هەریەکێك تۆمار بکە. ئەم وشانە بەکار بهێنە، گەرم، سارد، شلەتێن. (وێنەی أ)

٤ هەریەك لە کوپەکان پڕبکە لە ئاوی گەرم. یەك خولەك چاوەڕوان بکە، پاشان بەهێواشی دەسکی هەریەك لە کوپەکان بگرە. ئایا کامیان گەرمتر بوون؟ (وێنەی ب)

٥ ئەو وشانەی کە لە هەنگاوی چوارەمدا نووسیوتن، بەکاریان بهێنە بۆ نووسینی بڕی گەرمی دەسکی هەر یەکە لە کوپەکان.

## دەرئەنجام بکە

١. لەخشتەی کەوچکەکان ورد ببەوە. ئایا هەموو کەوچکەکان گەرم بوون؟کام لە کەوچکەکان گەرمتر بوو؟

٢. سەیری هەردوو خشتەکە بکە.کام ماددە گەرم بوو لەم دوو تاقیکردنەوەیەدا؟شتە پلاستیکیەکان لە ئاوی گەرم دا چۆن گۆڕان؟

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن** زاناکان جارجار تاقیکردنەوەکانیان کەمێك دەگۆڕن،لە کاتی تاقیکردنەوەی بیرۆکەکانیاندا. وا دابنێ کە دەتەوێت بزانیت ئایا دار بەساردی دەمێنێتەوە کاتێك لە سەرچاوەیەکی گەرمی نزیك دەکەوێتەوە. نموونەیەك لەسەر تەنێکی لەتەختە دروستکراو بهێنەرەوە، کە لە تاقیکردنەوەکەتدا بەکاری دەهێنێت.

کارامەیە | کردەییەکان | زانست

زاناکان بیر لە ڕێگەی کارکردنی شتەکان دەکەنەوە. گریمانەکان دادەنێن بۆ باس کردنی ڕێگەی کارکردنی شتەکان. وە بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی ئەم گریمانانە، تاقیکردنەوەکان ئەنجام دەدەن. تاقیکردنەوە جۆرێکە لە هەڵسەنگاندن کە بە وردیەکی تەواو ئەنجام دەدرێت بۆ وەدەست هێنانی زانیاری نوێ.



فێردەبم

# چۆن گەرمی دەگوازرێتەوە

## گەیاندن

لە چالاکی پێشوودا، کەوچکێکی کانزات خستە ئاوێکی گەرمەوە. ئەوە بووە هۆی گەرم بوونەوەی. گەرمی لە ئاوەگەرمەکەوە گوێزرایەوە بۆ کەوچکە ساردەکە. گەرمی لە تەنی گەرمەوە دەگوازرێتەوە بۆ تەنی ساردتر، لە کاتی دانانی هێلکەیەك لەناو مەقلییەك. ئینجا مەقلیەکە لەسەر ئاگرت دانا. گەرمی وادەکات مەقلیەکە گەرم بێت، ئینجا گەرمی راستەوخۆ دەگوازرێتەوە لە مەقلییەکە بۆ هێلکە. بە گوێزرانەوەی گەرمی لە نێوان تەنە بەر یەککەوتووەکان دەڵێن **گەیاندن**.

✔ **چۆن گەرمی لە نێوان ئەو تەنانەی بەیەکدەگەن، دەگوازرێتەوە؟**

**بناسە**

- ڕێگایەکی گواستنەوەی گەرمی.
- چۆن بە ئاسانی ڕێگا لە گواستنەوەی گەرمی دەگیرێت؟

**زاراوەکان**

گەیاندن

گەیێنەر

نەگەیێنەر

گەرمی دەگوێزرێتەوە لە تەنە گەرمەکان وەك گەرمکەر بۆ تەنی سارد وەك هێلکە ▼

## گەیێنەرەکان

لەوکاتەی دایکت شوربا گەرم دەکات، گەرمی لە گەرمکەر دەگوێزرێتەوە بۆ مەنجەڵ وە لەوێشەوە بۆ شۆرپا ساردەکەوە. وە هەر چەندە گەرمی زیاتر بگوازرێتەوە شورباکە زیاتر گەرم دەبێ.

**گەیێنەر** ئەو ماددەیە کە گەرمی بە نێوانیدا بە ئاسانی و خێرا دەگوێزرێتەوە. کانزاکان گەیێنەری باشی گەرمین. لەبەرئەوە زۆربەی مەنجەڵ و مەقلیەکان لە کانزای وەك مس و فافۆن و ئاسن دروست دەکرێن. کەوچکی کانزایی دوایی خستنی بۆ ناو شوربا گەرم دەبێ، بەڵام گەرمی بە ئاسانی بە پلاستیك و تەختەی دار تێپەڕ نابێت.

✔ دوو نموونە بۆ دوو گەیێنەری باشی گەرمی بهێنەوە؟









## نەگەیێنەرەکان

گەرمی فڕنێك یان ئاگردانێك وادەکات مەنجەڵەکانی کانزا یا مەقلیەکان یان سینیەکان زۆر گەرم ببن. وە ئەگەر کەسێك ویستی دەستیان لێبدات، دەستەکانی دەسووتێن وە بۆ پاراستنی دەستەکان لە سووتان دەستکێشی فڕن لەبەردەکرێت. دەست کێشی فڕن لە ماددەی ئەستوور دروستکراون، کە گەرمی بەناویاندا بە ئاسانی تێپەڕ نابێت. دەست کێشی فڕن کەواتە نەگەیێنەرن.

**نەگەیێنەر** ئەو ماددەیە کە گەرمی بەباشی ناگەیێنێ. قوماش و پلاستیك و تەختەدار ماددەی نەگەیێنەرن. هەواش نەگەیێنەرە. هەندێ لەو جلوبەرگەی کە لە بەریان دەکەین لە وەرزی زستاندا خورییەکەیان بڵقی هەوای تێدایە. هەوا رێگانادات گەرمی لە لەشەوە بۆ دەرەوە بگوازرێتەوە لەبەرئەمە هەست بە گەرمی دەکەین.

✔ دوو نموونە بهێنە بۆ دوو نەگەیێنەری باشی گەرمی.



دوو دەست کێشی نەگەیێنەر دەستەکانت دەپارێزن.

## پوختە

کاتێك تەنەڕەقەکان بەریەك دەکەون، وزەی گەرمی لە نێوانیاندا بە ڕێگای گەیاندن دەگوازرێتەوە. گەیێنەرەکان ڕێ گەرمی دەدەن بەئاسانی بەناویاندا بڕوات. نەگەیێنەرەکان ئەو ماددانەن کە وزەی گەرمی بە ئاسانی بە ناویاندا ناگوێزرێتەوە. کانزاکان گەیێنەری باشن بۆ گەرمی. تەختەدار و پلاستیك و قوماش و هەوا نەگەیێنەری گەرمین.

## پێداچوونەوە

١. چۆن گەرمی دەگوازرێتەوە نێوان دوو تەنی بەریەك کەوتوو؟

٢. ئایا دەست کێشی فڕن گەیێنەرن یان نەگەیێنەرن؟ باسی بکەن.

٣. ئایا ئەو خاوەی کە مەنجەڵی چێشت لێنانی لێ دروست دەکرێت گەیێنەرە یان نەگەیێنەرە؟ باسی بکە.

٤. ئەو گیانەوەرانەی کە خورییان هەیە، بەیارمەتی خورییەکەیان کە دایانپۆشیون گەرمیان دەکات. لەبەرچی هەست بە گەرمی دەکەیت لەکاتی لەبەرکردنی پالتۆیەك کە لە خوری دروست کرابێ؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقی کردنەوە** کام لەمانە گەیێنەری گەرمی باشن:

أ هەوا

ب قوماش

ج مس

د تەختەدار



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### کاتی خایەنراو بدۆزەرەوە.

گریمان کاتژمێر (٢:١٥) ی دوای نیوەڕۆ ئاگر لە ژێر دەفرێکی پڕ ئاو کرایەوە، کاتژمێر (٢:٣٥) ئاوەکە دەستی بە کوڵان کرد.
ئایا ئاوەکە تا دەستی کردووە بە کوڵان چەندی کات پێچووە؟



### بنەماکانی ساخلەمی

مرۆڤ پێویستی بە گەرمی هەیە، بەڵام بەکارهێنانی مەترسی دروست دەکات. دوو بنەمایی ساخلەمی کە لە چێشتخانەکاندا پێویستن لەکاتی چێشت لێناندا بنووسە.

بەندی ٢ پێداچوونەوە و ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

زاراوەی گونجاو بۆهەر پێناسەیەك لەمانەی خوارەوە هەڵبژێرە. ژمارەی لاپەڕە تۆمارکراوەکەی نێوان ( ) دەستنیشانی شوێنی زانیارییەکان دەکات لەبەشەکەدا کە لەوانەیە پێویستت پێی بێت.

| | |
|---|---|
| گەرمی (١٧٠) | گەیاندن (١٧٦) |
| پلەی گەرمی (١٧٢) | گەیێنەر (١٧٧) |
| گەرمی پێو (١٧٢) | نەگەیێنەر (١٧٨) |

١. ______ گواستنەوەی گەرمی لە نێوان دوو تەنی بەریەك کەوتوودا.

٢. ______ ئەومادەدەیە کە گەرمی بە ئاسانی بەناویدا تێپەڕ نابێت.

٣. ______ شتێکە وادەکات شتەکان گەرم ببن.

٤. ______ ئەو ماددەیە کە بەئاسانی گەرمی پێدا دەگوازرێتەوە.

٥. ______ ئامێرێکە پلەی گەرمی دەپێوێت.

٦. ______ پێوانی توانایی گەرم بوونی تەنێك یان ساردیەکەی.

## بەستنەوەی چەمکەکان

ئەم زاراوانەی خوارەوە لە شوێنی گونجاودا لەسەر نەخشەی چەمکەکان بنووسە:

گەرم　　گەیێنەر　　گەیاندن　　گەرمی　　نەگەیێنەر　　سارد

گەرمی

١. ______ وادەکات شتەکان بکوڵێن.

هەمیشە گەرمی دەگوێزرێتەوە بەتەنی
٢. ______
بۆ ٣. ______

٤. ئاسن ______
باشی گەرمییە

گەرمی دەگوێزرێتەوە لە نێوان دوو تەنی بەریەك کەوتوو بە ڕێگەی
٥. ______

پلاستیك
٦. ______ باشی
گەرمییە

## دڵنیابوون لە تێگەیشتن

پیتی هەڵبژاردەی گونجاودا بازنەدار بکە:

١. کامە لەمانە نەگەیێنەرن؟

أ کەوچکێکی زیو ج کەوچکی پۆڵا

ب پەڕەی ئەلەمنیۆم د کەوچکی دار

٢. کام لەمانەی خوارەوە گەیێنەرن؟

أ کەوچکی دار ج پەڕەی فافۆن

ب دەستکێشی فرن د چاکەتی خوری

٣. نیان پارچە سەهۆڵێك لەسەر دەستی دادەنێت:

أ گەرمی لە پارچە سەهۆڵەکە دەگوازرێتەوە بۆ دەستی نیان.

ب گەرمی لەدەستی نیان دەگوازرێتەوە بۆ پارچە سەهۆڵەکە.

ج گەرمی ناگوازرێتەوە نێوان دەستی نیان و پارچە سەهۆڵەکە.

د گەرمی لە پارچە سەهۆڵەکە بۆ دەستی نیان دەگوازرێتەوە، وە لەویش بۆ پارچە سەهۆڵەکە.

٤. دەستی مەقلیی لە دار دروست دەکرێت، چونکە دار: ________.

أ گەیێنەری گەرمییە.

ب ڕەق و بەهێزە و ناشکێت.

ج موگناتیس ڕایناکێشێت.

د نەگەیێنەرە.

**وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە:**

٥. لەوکاتەی مەنجەڵێکی گەرم لە فرن دەردەهێنرێت پارچە قوماشێك لەسەر ئەو مێزە دادەنرێت مەنجەڵەکە لەسەری دادەنرێت لەبەرچی؟

## پێداچوونەوەی کارامەیی کردەکانی زانست

**ئەو گریمانەیە چییە** دایدەنێت دەربارەی پلەی گەرمی قووڵایی لە ٣٠ سم خاك لە مانگی گەلاوێژ لە کوردستان؟ چۆن لە **گریمانەکەت دڵنیا دەبیت؟**

## هەڵسەنگاندنی بە جێ هێنان




وێنەی گەرمی پێوێك بکە

ئاو لەپلەی (١٠٠ °C) سیلیزی دادەکوڵێت و لەپلەی (٠) °C دەیبەستێت. وێنەیەك بۆ گەرمیپێوێك، بکێشە کە بە شلەیەك کاردەکات، کاتێك لەناو ئاوی کوڵاو دانرابێت. وێنەیەکی تر بۆ هەمان گەرمیپێو بکێشە کاتێك دانرابێت لە ناو ئاو کە دەیبەستێت، باس لەوەبکە چی ڕوو دەدات کاتێك گەرمیپێوێك لە ئاوێکی کوڵاوەوە بۆ ئاوێك کە دەیبەستێت دەگوازرێتەوە؟

# بەندی ٣

# هێز و جووڵە

ئایا رۆژێك بیرت لەوە کردەوە کە تۆپێك بە خێراییەکی زۆر فڕێ بدەیت کە ئیتر تۆپەکە نەگەڕێتەوە سەر ڕووی زەوی؟ پێویستیمان بە وزەیەکی زۆر هەیە تا ڕزگاربین لە هێزی کێشکردنی زەوی. کێشکردن ئەو هێزەیە کە تەنەکان ڕادەکێشێت بەرەو زەوی. کەشتی بۆشایی ئاسمان ئاکە ئامێرێکە کە مرۆڤ دروستی کردووە و توانیویەتی بەسەر کێشکردنی زەویدا زاڵ بێت و بگاتە بۆشایی ئاسمان.

## زاراوەکان

هێز
جووڵە
خێرایی
کێشکردن
لێکخشاندن
ئامێری سادە
نوێڵ
ڕووی لێژ (لار)
پواز
خلۆکە

### زانیارییەکی خێرا

تۆ ناتوانیت گەشتێك بکەیت بە خێراییەك تا لە هێزی کێش کردنی زەوی تێپەڕیت. بەڵام ئایا زۆرترین خێرایی کە پێی دەڕۆیت لەسەر زەوی چەندە؟ لەوانەیە خێرایی ئوتومبێلێکی پێشبڕکێ بگاتە (٣٥٠کم) لە سەعاتێکدا، کەواتە ٤ سەعاتی دەوێت بۆ بڕینی ماوەی (١٤٠٠کم) لەنێوان شاری بەسرەو سلێمانی ئەگەر بەو خێراییە بڕوات.

#### کاتی پێویست بۆ گەشتکردن لە بەسرە بۆ سلێمانی

| تەن | خێرایی | کات |
|---|---|---|
| وەرزش وانێکی تەمەن ٨ساڵ | ٢٠کم لە کاتژمێرێکدا | ٧٠ کاتژمێر |
| فڕۆکەی فیشکەدار | ٤٨٣کم لەکاتژمێرێکدا | دووکاتژمێر و ٥٣ خولەك |
| فڕۆکەی سەرووی دەنگ | ٢١٧٣ کم لەکاتژمێرێکدا | ٣٨ خولەك |
| گالیسکەی بۆشایی ئاسمان | ٤٠٢٣٣ کم لە کاتژمێرێکدا | دوو خولەك و ٥ چرکە |
| نەیزکی خێرا | ٢٤١٣٩٥ کم لە کاتژمێرێکدا | ٢١ چرکە |
| ڕووناکی | ٢٩٩٣٣٠ کم لە کاتژمێرێکدا | ٠,٠٠٤٦٧٧١ لە چرکەدا |

## زانیارییەکی خێرا



بۆ ئەوەی تۆپەکە نەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی، پێویستە بەلای کەمەوە بە خێرایی (٤٠٠٠٠)کم لە کاتژمێرێکدا فڕێ بدرێت. بەڵام خێرایی تۆپێك کە لێهاتووترین وەرزشوان فڕێی دەدات لە (١٦٠)کم لە سەعاتێکدا تێپەڕناکات.

# وانەی ١

# چۆن هێز دەبێتە هۆی جووڵە ؟

لەم وانەیەدا ....

**لێدەکۆڵیتەوە**
کەچۆن هێز کار لە خێرایی دەکات

**فێردەبیت**
چۆن هێز کار لە جووڵە دەکات

**زانستەکان**
دەبەستیتەوە بە بیرکارییە و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان



## لێدەکۆڵمەوە

## لێژی خێرایی

**ئامانجی چالاکییەکە** پایسکل سواری بەرەو خوارەوە لە رێگایەکی لێژ ئاسانترە لە هاتنە سەرەوە بە هەمان رێگا. وە هەروەها پاسکیلەکەشی خێراتر دەبێ. لەم چالاکییەدا بۆت دەردەکەوێ چۆن لێژی رێگایەکە کاریگەری هەیە لەسەر خێرایی.

### کەرەستەکان

- کتێب
- سینیی فرن
- بارستەیەکی دار
- پارچەدراوی کانزایی
- شەپانتە
- راستە

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ چەند کتێبێك لەسەر یەکتری دابنێ بە بەرزی ٥سم تۆماری بەرزی کتێبەکانی خشتەکە بکە (وێنەی أ).

٢ لێژێك دروست بکە بە دانانی لایەکی سینیەك لەسەر دەستەی کتێبەکان.

٣ لەسەر بەشە بەرزەکەی سینیەکە پارچەدراوی کانزایی و بارستەدارەکە و شەپانتەکە دابنێ. وا بکە کە ئەم شتانە بە یەکەوە لە هەمان کات بجولێنەوە.



ئەگەر منالەکە بە هێزێکی زیاتر شووت لە تۆپەکە بدات ئەوا بە خێرایی زیاتر دەجولێت



وێنەی آ



وێنەی ب

٤ تۆماری بکە کام تەن خێراترە. ئەم وشانە بەکاربهێنە وەك، خێرابوون، هێواش بوون، ناجولێت.

٥ کتێبی زیاتر لەسەر دەستەی کتابەکات دابنێ تا بەرزیان دەبێتە ١٠ سم. هەنگاوەکانی ( ٢ تا ٤ ) دووربارە بکە.

٦ کتێبی زیاتر لەسەر دەستەی کتابەکان دابنێ تا بەرزیان دەبێتە ١٥ سم. هەنگاوەکان ( ٢ تا ٤ ) دووبارەبکەوە.

**خشتەی داتاکان «لێژی خێرایی»**

| تەن | بەرزی کتێبەکان بە سم | خێرایی |
|---|---|---|
| پارچەدراوی کانزایی | | |
| | | |
| | | |
| بارستایی دار | | |
| | | |
| | | |
| شەپانتە | | |
| | | |
| | | |

کارامەییە گردەییەکان زانست

بۆ قوتابییەکان روون بکەوە کە دیاریکردن مانای روونکردنەوەی داتاکانە لە بنەمای ئەو شتانەی کە دەیزانین

## دەرئەنجام بکە

١. بەراوردی خێرایی ئەو تەنانەی کە دەخزێن بکە لەگەڵ گۆڕانی بەرزی کتێبەکان. تێبینییەکان تۆمار بکە.

٢. دیاری بکە لەبەرچی خێرایی تەنەکان گۆڕا؟

٣. **چۆن زاناکان کاردەکەن** پێشبینی بکە چۆن ئەنجامەکان دەگۆڕێن، ئەگەر سینیەکە بە چینێکی تەنك لە زەیت داپۆشرا.



## فێردەبم

# هێز و جووڵە

بناسە
- کاریگەری هێز لەسەر جووڵە
- جووڵە
- خێرایی
- کێشکردن
- لێکخشاندن

**زاراوەکان**

هێز
جووڵە
خێرایی
کێشکردن
لێکخشاندن

### هێز

ئەگەر ویستت تۆپێك بجولێنی، بەدەست لێیدەدەیت یان بەپێ لێدەدەیت یان بە دارێك لێدەدەیت. **هێز** بریتییە لە پاڵنان و راکێشان. تۆ پاڵ بە دەرگاوە دەنێیت، یان گالیسکەیەك رادەکێشی. هەر پاڵنانێك و راکێشانێك هێزە. دەبێ هێز ئەنجام بدەیت لەسەر تەنێك بۆ ئەوەی بیجولێنی. هەر تەنێك بەردەوام دەبێ لەسەر جووڵە تا هێزێکی دیکە دەیوەستێنێت.

✔ هێز چییە؟



▲ لەکاتی کردنەوەی چەکمەجەیەك هێزی راکێشان بەکاردێنیت.



▲ ئەم پیاوە گالیسکەیەك دەجولێنی بە پاڵنانی، پاڵنان هێزە.

گۆڵچی بە دەستەکانی کار لە تۆپەکە دەکات تا لە جووڵە بیوەستێنێ. ▼



## جووڵە

باڵندەکان لە ئاسماندا دەفڕن. مێرووولەکان لەسەر زەوی دەخشێن. تۆپ لەسەر زەوی دەجولێت. بەهۆی هەوا گەڵای ڕووەکەکان دێن و دەچن.

تایەکانی پاسکیل دەسوڕێنەوە. هەموو ئەم شتانە لە جووڵە دانە. **جووڵە** بریتییە لە گۆڕینی شوێن. بۆ هەر شتێك شوێنێك هەیە. تۆ شوێنی خۆت لەناو پۆلدا دەزانیت. وە بۆ ئەوەی بگەیتە تەختەڕەش شوێنی خۆت دەگۆڕی. واتە دەجووڵێیت. تۆ شوێنی خۆت لە ناو پۆلەکەت لە قوتابخانەکەت دەزانی.

شوێنی پۆل ناگۆڕیت، پۆل ناجووڵێت.

✔ **جووڵە چییە؟**



▲ یاریزانەکانی ناو گۆڕەپانی یاریکردن تۆپی پێ لە جووڵەیاندا بەردەوامن. شوێنەکانیان بە بەردەوامی دەگۆڕێت.

## خێرایی

ئەو ماوەیەی کە تەنێك لە کاتێکی دیاریکراودا دەیبڕێت بە **خێرایی** دەناسرێت. خێرایی بە یەکەی کیلۆمەتر لە کاتژمێرێك دا دەپێورێت (یەك کیلۆمەتر = ١٠٠٠ مەتر). ئەو تەنەی ماوەی درێژتر دەبڕێت لە هەمان کاتدا خێراییەکەی زیاترە.

ئەگەر لەگەڵ هاورێکەت لە خاڵێکی دیاریکراو دەرپەڕین لە گۆڕەپانی قوتابخانە بۆ دەرگای دەرەوە، ئەوەی کە پێشتر دەگاتە دەرگاوە خێراییەکەی زیاترە.

ئەگەر تەنەکان دوری جیاواز ببڕن لە هەمان کاتدا، ئەوا خێرایی جیاوازیان دەبێت. ئۆتۆمبیل بە خێراییێکی زیاتر لە پاسکیلێك دەجوولێت و پاسکیلیش بە خێرایی زیاتر لە منالێك کە دەڕوات دەجولێت.

هەرچەندە هێزی کارکردوو زیاد دەبێ، تەنەکە بە خێراییەکی زیاتر دەجوولێت.

✔ خێرایی چییە؟




ژمێرەری خێرای لە ئوتومبێل نیشاندەدات کە ٧٠کم لە کاتژمێرێکدا دەبڕێت.

خێرایی تەن ئاماژەیە بۆ ئەو دوورییەی کە لە کاتێکی دیاریکراودا دەیبڕێت، هەندێك شت هەن خێراتر دەجوولێن لە هەندێکی تر.



# جۆرەکانی هێز

## کێشکردن

**کێشکردن** هێزێکە شتەکان بەرەو زەوی رادەکێشێت. بۆیە هەر شتێك لە دەستمان بەربێتەوە دەکەوێتە خوارەوە. ئەگەر هیچ شتێکی دیکە نەیوەستێنێت. ئەگەر شتێکت هاوێشت ئەوا بەکێشکردن دەکەوێتە سەر زەوی. کێشکردن ئەو هێزەیە کەوا لە شتەکان دەکات. بخزین بۆ خوارەوەی لێژییەکەی چالاکی پێشوو. وە کێشکردن وادەکات مرۆڤ و شتەکانی دیکە لەسەر رووی زەوی بمێنن.

✔ کێشکردن چییە؟



▲ هێزی کێشکردنی زەوی ئەو هێزەیە کە هێلکەکە بەرەو زەوی ڕادەکێشێت. هەموو شتەکانی کە لەسەر ڕووی زەوی هەن دەکەونە خوارەوە.



◄ کێشکردن ئەو هێزەیە کە سێو بۆ ڕووی زەوی ڕادەکێشێت. کاتێك لە لقی دارەکە دەبێتەوە و دەکەوێتە خوارەوە.



گالیسکەی بۆشایی ئاسمان
( ٣٠٠٠٠ کم لە کاتژمێر)



فرۆکەیەك خێراییەکەی
( ١٠٠٠ کم لە کاتژمێرێکدا)



ئۆتۆمبێلێکی پێشبرکێ
( ٣٨٠ کم لە کاتژمێر)

## لێکخشاندن

**لێکخشاندن** هێزێکە جووڵەی تەنەکان کەم دەکاتەوە یان دەیانوەستێنێت لە جووڵە. هێزی لێکخشاندن پەیدادەبێ لەوکاتەی کە دوو تەن بە یەکتری دەخشێن. ئەگەر تۆپێکی پێ لەسەر زەوی یاریگە جوولایەوە. لە جووڵەکەیدا بەردەوام دەبێ، بەڵام لە کۆتاییدا لە جووڵە دەوەستێت، لەبەر هێزی لێکخشاندنی تۆپەکە و زەوی یاریگەکە. ڕووە لووسەکان هێزی لێکخشاندنی لاوازیان هەیە بەرامبەر بە ڕووە زبرەکان. شتەکان بە ئاسانی لەسەر ڕووە لووسەکان دەخزێن. بەڵام لەسەر ڕووە زبرەکان بە گرانی دەخزێن.

✔ **هێزی لێکخشاندن چییە؟**

▼ هێزی لێکخشاندن لە نێوان تایەکانی پایسکل و زەوی وادەکات پایسکلەکە بجووڵێت. وە هێزی لێکخشاندن لە نێوان تایەکان و وەستێنەرەکان جووڵەی پایسکلکە کەم دەکات یان دەیوەستێنێت.



## پوختە

هێز ڕاکێشان یان پاڵنانە. جووڵە بریتییە لە گۆڕانی شوێن. هۆی هەموو جووڵە هێزە. خێرایی بریتییە لەو دووریەی کە تەنێك دەیبڕێت لەیەکەی کات. کێشکردن ئەو هێزەیە کەتەنەکان بۆ لای چەقی زەوی ڕادەکێشێت. لێکخشاندن بریتییە لەو هێزەی کە تەنەکان لە خێرایی جووڵەیان کەم دەکات یان دەیانوەستێنێت.

## پێداچوونەوە

١. هێز چییە؟

٢. ئەو هێزە چییە کە تەنەکان بەرەو زەوی ڕادەکێشێت؟

٣. خێرایی چییە؟

٤. چی بەسەر تاوێرێك دێت لەوکاتەی لەسەر لێژیکدا دەبێت ئەگەر هیچ هیزێك کاریگەری نەکاتە سەری؟

٥. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** چی دەگۆڕێت لەکاتی جووڵەی تەنێك؟

أ شێوەکەی

ب بارستاییەکەی

ج شوێنەکەی

د قەبارەکەی



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### لێ دەربکە

پڵنگێك بە خێرایی (١١٠) کم لە کاتژمێرێکدا دەڕوات. کەرە کێوی بەخێرایی ٦٠ کم لە کاتژمێرێکدا دەڕوات. خێرایی کامیان زیاترە و بەچەند زیاترە؟



بەستنەوە بە لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵایەتی

### نیوتن

سەرچاوەکانی ناو کتێبخانەی قوتابخانەکەت بەکاربهێنە. یان لە گەورەکانی خێزانەکەت بپرسە بۆ ئەوەی زانیاریت دەست بکەوێ لەسەر ژیانی زانا (ئیسحاق نیوتن).
لەگەڵ هاورێکانت بەشداری بکە لەم زانیاریانە.

وانەی ٢

# ئامێرە سادەکان چیین؟

لەم وانەیەدا ...



**دەکۆڵیتەوە**
ڕۆڵی نوێلەکان



**فێردەبیت**
هەندێ جۆری ئامێرە سادەکان



**زانستەکان**
دەبەستیتەوە بە بیرکاری و نووسین



## لێکۆڵــەوە

# بەکارهێنانی نوێل

**ئامانجی چالاكییەکە** جووڵاندنی شتەکان یان بەرزکردنیان، ئەو ئامێرانە بەکاردەهێنی کە یارمەتیت دەدەن. یەکێك لەم ئامێرانە نوێلەکانە. لەم چالاکییەدا نموونەیەك دروست دەکەین کە نوێلەکە بۆ زانینی چۆنیەتی کارکردنی.

### کەرەستەکان

- **پاککەرەوە ( ٢ )دانە**
- ڕاستەیەکی یەك مەتری توند
- کتێبێکی بچووك

### هەنگاوەکانی چالاکییەکە

١ هەردوو شەپانتەکان لەسەر یەکتری دابنێ.

٢ ڕاستەی مەترییەکە لەسەریان دابنێ بە مەرجێك هاوسەنگ نەبێ.



ئەم پیاوە بورغوکەرەوە بەکاردەهێنێ وەك نوێل بۆ کردنەوەی سەرپۆشی ئەم قوتوو.



وێنەی أ



وێنەی ب

٣ لەولایەی کە نزیکە لەهەردوو شەپانتەکان کتێبەکە لەسەر راستەکە دابنێ وەك ئەوەی لە وێنە (أ) هاتووە.

٤ بە پەنجەکەت پەستان بخە سەر لایەکەی دیکەی راستەکە بەرەو خوارەوە، چاودێری کتێبەکە بکە چی بەسەر دادێت (وێنە ب).

٥ کتێبەکە بەرزبکەرەوە بە دەستت و بڕی ئەو هێزە کە بەکارت هێنا بخەمڵێنە.

کارامەیە | گردەییەکانی | زانست

لەکاتی دروستکردنی نموونەیەك دەتوانم بەکاریبهێنم بۆ ئەوە بزانم چۆن کاردەکات.

## دەرئەنجام بکە

١. بەراورد بکە لە نێوان ئەو هێزەی کە بەکارت هێنا لە بەرزکردنی کتێبەکە لە هەنگاوی (٥) و هێزی بەکارتهێنا لە هەنگاوی ٤ .

٢. چۆن بەکارهێنانی راستەکە و هەردوو شەپانتەکان ئاسان کاریانکرد بۆ بەرزکردنی کتێبەکە.

٣. راستەو شەپانتەکان نموونەی ئامێری سادەن کە پێی دەڵێن نوێڵ. ڕۆلی نوێڵ لە جووڵاندنی تەنەکان چییە؟

٤. **چۆن زاناکان کاردەکەن** گریمان کتێبەکەت لەلای دیکەی راستەمەتریەکە دانابێت کە دوورە لە شەپانتەکان.
پێشبینیکردن: بەرزکردنی کتێبەکە بە بەکارهێنانی راستە و شەپانتەکان ئاسانتر دەبێ لە جاری یەکەم یان نا؟
پێشبینییەکەت تاقی بکەوە.

# ئامێرە سادەکان

**بناسە**

- ئامێری سادە
- ناوی هەندێ ئامێری سادە

**زاراوەکان**

ئامێری سادە
نوێڵ
ڕووی لار
پواز
خلۆکە

## نوێڵ

**ئامێری سادە** ئامێرێکە یارمەتی خەڵك دەدات بۆ جووڵاندنی شتەکان بە ئاسانێکی زۆر. دەکرێ شتەکان بجووڵێنی بە بەکارهێنانی ئامێرێکی سادە ناسراوە بە نوێڵ.

**نوێڵ** بریتییە لە تووڵێك کە لەسەر خاڵێك جێگیر دەبێ و لە دەورەیدا خول دەخوات کە بە خاڵی جێگیربوون دەناسرێت. لە چالاکییەکەی پێشوودا زانیت کە نوێڵ هێزی بەرزکردنی تەنێك کەم دەکاتەوە. هەندێجار بۆ خوارەوە پاڵ دەنێت لەلایەکی نوێڵدا، دەبێتە هۆی بەرزبوونی لایەکەی دیکەی بۆ سەرەوە. هەروەك لەکاتی کارکردنی ئامێری دەرهێنانی بزمارەکان وە هەندێجار لایەکی نوێڵ بۆ سەرەوە پاڵی پێوەدەنرێت، دەبێتە هۆی بەرزبوونی کێش بۆ سەرەوە. گالیسکەی دەستی نموونەیە بۆ ئەمە.

### ✔ ئامێری سادە چیین؟

▼ لەوکاتەی هەردوو دەسکەکانی ئەم گالیسکەیە پاڵیان دەنێت بۆ سەرەوە. بارستەکەی لەسەری دا بۆ سەرەوە بەرزدەبێت.



ئەم ئامێرە بۆ لابردنی بزمارەکانە. لەوکاتەی لایی سەرەوەی ئەم ئامێرە بۆ خوارەوە پاڵ دەنێیت، بزمارەکە بۆ سەرەوە دەردەچێت لەلای دیکەی ئامێرەکەوە. ▼

نوێڵ

خاڵی جێگیر

## رووی لار

دەکرێت تەنەکان بجووڵێنیت بە ئاسانی زیاتر لەکاتی بەکارهێنانی رووی لار. **رووی لار** ئامێرێکی سادەیە جووڵە و بەرزکردنەوەی شتەکان ئاسان دەکات، کە ئەویش پێکهاتووە لە ڕوویەکی ڕاست کە لایەکی بەرزترە لەلایەکەی دیکە.

لەکاتی بەکارهێنانت بۆ رووێکی لار، هێزێکی کەمتر بەکاردەهێنیت لەوەی کە پێویستت پێیە بۆ بەرزکردنی تەنەکان.

✔ رووی لار چییە؟



▲ ئەم نەوجەوانە بەتوندی پاڵ بەم گالیسکەیە دەنێت هێزی کەمتر بەکاردێنێت لەوەی کە ڕاستەوخۆ بەرزی بکاتەوە لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی بەرزتر.

## پواز

**پواز** ئامێرێکی سادەیە بەکاردێت بۆ برینی شتەکان یان کەرت کردنیان. لە دوو ڕووی لار و بەیەك لکاو پێکهاتووە. پواز بەکاردێت بۆ دورخستنەوەی دوو شت یان دابەشکردنی تەنێك بۆ دووبەش. چەقۆ، بیور نموونەن بۆ پواز.



▲ چەقۆ پوازە



▲ بیور پوازە دار دەبڕێت.



«قەڵەم چەکوش» پواز تاوێر دەشکێنێ ◄

## خلۆکە

**خلۆکە** ئامێرێکی سادەیە پێکهاتووە لە پەتێك وە یان زنجیرێکی کانزایی کە بەسەر پەپکەیەکدا دەسووڕێتەوە. لەوکاتەی کە لایەکی پەتەکەی زنجیرەکەی بۆ خوارەوە رایدەکێشێت، لای دیکەی بەرز دەبێتەوە. خلۆکە ئاراستەی ئەو هێزەی کە ئەنجامی دەدەیت دەگۆڕێت. وە بڕەکەی ناگۆڕێت. لەوکاتەی کە لایەکی پەتەکە رادەکێشیت بۆ خوارەوە، ئەو تەنەی کە بە لای دیکە پەتەکە بەستراوە بەرزدەبێتەوە بۆ سەرەوە. لەبەر هێزی کێشکردن راکێشان بۆ خوارەوە ئاسانترە لە راکێشان بۆ سەرەوە. لەبەرئەوە خلۆکە بەرزکردنی تەنەکان بۆ سەرەوە ئاسان دەکات.

✔ **خلۆکە چۆن کاردەکات؟**



▲ خلۆکە لە بڕی ئەو هێزەی کە پێویستە بۆ بەرزکردنی تەنەکان کەم ناکات.





◄ لە بەرزایی ستوونی ئاڵادا خلۆکە بەکاردەهێنرێ بۆ بەرزکردنەوەو هێنانە خوارەوەی. خلۆکە پەپکەیەکە و پەتێکی بەسەردا دەڕوات.

## پوخته

ئامێری سادە جووڵاندنی تەنەکان ئاسان دەکەن. ئەویش بە کەم کردنی بڕی ئەو هێزەی کە پێویستە بۆ جووڵاندنی تەنەکان، یان گۆڕینی ئاراستەیان.

نوێڵ و رووی لار و خلۆکە و پواز و بورغو نموونەن بۆ ئامێری سادە.

## پێداچوونەوە

**١**. نوێڵ وەسف بکە؟

**٢**. ڕووی لێژ و پواز بە چی لەیەك دەچن؟

**٣**. ڕۆڵی خلۆکە چییە؟

**٤**. دوو ڕێگا بڵێ کە ئامێرە سادەکان ئاسانکاری دەکەن لە جووڵەی تەنەکان.

**٥**. **ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوە** کام ئامێری سادە لە جۆری پوازە؟

أ خلۆکە

ب نوێڵ

ج بیور

د ئامێری دەرهێنانی بزمار



## بەستنەوەکان



بەستنەوە بە بیرکاری

### شیکاری پرسیارێك

ئەڤین خلۆکەی بەکارهێنا بۆ بەرزکردنەوەی تەنێك لە بیرێکدا کە بارستاییەکەی ١٠ کیلۆگرام بوو. ئەڤین بەلای دیکەی پەتەکە تەنێك بارستاییەکەی ٧ کیلۆگرامە هەڵواسی. ئایا تەنی ناو بیرەکە بەرز دەبێ بۆ سەرەوە یان نا؟ وە لەبەرچی؟



بەستنەوە بە نووسین

### باسکردن

لە ژیانی ڕۆژانەتدا زۆر شت بەکاردەهێنی لە ڕاستیدا ئەمانە نوێڵن. وەك مووکێش و گرە. یەکێك لەم دوو شتانە هەڵبژێرە و باسی بکە چۆن بەکاری دەهێنی.

## پێداچوونەوەی زاراوەکان

زاراوەی گونجاو بۆهەر پێناسەیەك لەمانەی خوارەوە هەڵبژێرە. ژمارەی لاپەڕە تۆمارکراوەکەی نێوان ( ) دەستنیشانی شوێنی زانیارییەکان دەکات لە بەندەکەدا کە لەوانەیە پێویستت پێی بێت.

| | |
|---|---|
| هێز (١٨٦) | ئامێری سادە (١٩٤) |
| جوولە (١٨٧) | نوێڵ (١٩٤) |
| خێرایی (١٨٨) | ڕووی لار (١٩٥) |
| کێشکردن (١٨٩) | پواز (١٩٥) |
| لێکخشاندن (١٩٠) | خلۆکە (١٩٦) |

١. ـــــــ ئەو دووریەی کە تەنێك دەیبڕێت لە کاتێکی دیاری کراو؟

٢. ـــــــ ڕووێکە لارە دەبێتەوە بە گۆشەیەك لەسەر ڕوویەکی ترەوە.

٣. ـــــــ گۆڕانی شوێنە.

٤. ـــــــ هێزی ڕاکێشانی تەنەکانە بۆ زەوی.

٥. ـــــــ ئامێرێکە یارمەتی خەڵك دەدات بۆ جووڵاندنەوەی شتەکان بە ئاسانی.

٦. ـــــــ ئەو توولە یە کە بە دەوری خاڵێکی جێگیر دەخووڵێتەوە.

٧. ـــــــ بریتیە لە پاڵنان یان ڕاکێشان.

٨. ـــــــ پێکهاتووە لە دوو رووی لاری بەیەکەوە نوساو.

## بەستنەوەی چەمکەکان

سەرنجی وێنەکە بدە پاشان دەستەواژەکانی ئەم بەشە بەکار بهێنە بۆ تەواوکردنی ئەم ڕستانەی خوارەوە:



١. پاڵپێوەنانی تۆ بۆ لۆریەکە بریتییە لە ـــــــ .

٢. درێژی لێژیەکە بریتیە لە ـــــــ کە پێویستە لۆریەکە بیبڕێت.

٣. ئەو ئامێرە سادەیەی لۆریەکە بە سەری دەکەوێت پێی دەڵێن ـــــــ .

## دڵنیابوون لە تێگەیشتن

پیتی هەڵبژاردەی گونجاو دابنێ.

١. بەردێك جێگیر دەبێت لەسەر لێواری کەندێك. ڕۆژێك دێت بەردەکە دەکەوێت. ئەوە چ هێزێکە کە دەبێتە هۆی ئەم جووڵانەی لەوانەیە ـــــــ بێت.

أ ڕووی لێژ
ب خلۆکە
ج لێکخشاندن
د کێشکردن

٢. کرێکارەکانی فرۆکەخانە لاریەکی جوولاو بەکار دێنن بۆ ئەوەی جانتاکان بخەنە ناو فرۆکە. لار چ جۆرە ئامێرێکی سادەیە:

أ ڕووی لار     ج نویڵ

ب پواز     د خلۆکە

٣. فرۆکەیەك (٥٥٠) کم لەکات ژمێرێکدا دەبڕێت. ئەم ژمارە پێوەرە بۆ ________.

أ بەرزی     ج سووتەمەنی

ب خێرایی     د کێش

٤. ئەو ئامێرە سادەیەی کە شیلان بەکاری دەهێنی بۆ بەرزکردنی دوو قوتوی بۆیە بۆ نهۆمی دووەم. لەوکاتەی کە خۆی لەسەر زەوی دایە؟

أ خلۆکەیە

ب ڕووی لارە

ج پواز

د بورغوە

٥. ________ جوولەی تەنەکان کەم دەکات یان دەیانوەستێنێت

أ کێشکردن

ب خێرایی

ج هێزی لێکخشاندن

د خلۆکە

**وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە:**

٦. بۆچی پێویستمان بە هێزی کێشکردن دەبێ لەکاتی یاریکردن بە جۆلانەوە؟

## پێداچوونەوەی کارامەیی کردەکانی زانست

١. ئۆتۆمبێلێکی سوورو ئۆتۆمبێلێکی شین ڕۆیشتن بۆ شاری دهۆك کە دەکەوێتە دووری ١٠٠ کم. ئۆتۆمبێلی سوور پێش شین گەیشتە دهۆك. چیت بۆ دەردەکەوێت دەربارەی خێرایی هەردوو ئۆتۆمبێلەکە؟

٢. مامۆستا داوا لە قوتابییەکان دەکات بۆ ئەوەی شتەکانی ناوپۆل بەکاربهێنن بۆ دروستکردنی ئامێرێکی سادە. چاوت کەوت بە ڕاستە و شەپانتە. پێشبینی بکە دوو ئامێری سادە قوتابییەکان دروستی بکەن لە ڕاستە و شەپانتەکانەوە.

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

### ئامێرە سادەکان

لەگەڵ هاوڕێکانت نەخشەیەك بکە بۆ دانان و دروست کردنی ئامێرێك کە بتوانی بەکاری بهێنی بۆ گواستنەوەی کتێبی قوتابخانە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر لەسەر مێزەکەت. دڵنیابە کە ئامێرەکە یەکێك لە ئامێرە سادەکانی تێدا بێت.

# چالاكیی بۆ ماڵ یان قوتابخانە

## ئامادەكردنی گیراوەكان

## كامیان گونجاوترە بۆ ئامادەكردنی گیراوە ئاوی گەرم یان ئاوی سارد؟

### كەرەستەكان

- دوو دەفری شووشەی بچووك بەرگەی گەرمی بگرن
- شەكر
- ئاوی شلەتێن
- ئاوی سارد
- كاتژمێرێك كە چركەژمێری هەبێت.
- كەوچك

### هەنگاوەكان



❶ یەكێك لە دەفرەكان پڕ بكە لە ئاوی سارد.

❷ كەوچكێك شەكر تێكەڵی ئاوی سارد بكە. ئاوەكە بجوڵێنە تاكو شەكرەكە دەتوێتەوە.

❸ چاودێری كاتژمێرەكە بكە بۆ ئەوەی كاتەكە بزانی ژمارەی چركەكانی كارەكە تۆمار بكە.

❹ هەنگاوەكانی ١-٣ دووبارە بكەوە ئەمجارە ئاوی شلەتێن بەكاربێنە. ژمارەی چركەكان تۆمار بكە.

### دەرئەنجام بكە

لەچی روویەكەوە ئەنجامەكان جیاوازبوون؟ بۆچی ئەنجامەكان جیاوازبوون؟

## ساردكردنەوەی ئاو

## چەند كاتت پێویستە بۆ سارد كردنەوەی ئاوی گەرم؟

### كەرەستەكان

- دوو كوپی پلاستیكی
- سەنگ
- دوو گەرمی پێو
- كات ژمێری ڕێكخەری كات
- ئاوی گەرم

### هەنگاوەكان



❶ یەكێك لە كوپەكان بەتەواوی پڕبكە لەئاوی گەرم. كوپەكەی تریش تا نیوەی ئاوی گەرمی تێبكە.

❷ لەكام لەو دوو كوپەدا ئاو زۆرتر سارد دەبێتەوە؟ گریمانە دابنێ بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەكە. گریمانەكە بنووسە

❸ خشتەیەك دابنێ بۆ تۆماركردنی پلەی گەرمی. پلەی گەرمی سەرەتایی بۆ هەر كوپێك تۆماربكە، پاشان پلەی گەرمی بۆ هەر دوو كووپەكە بۆ هەر خولەكێك تۆمار بكە تا پلەی گەرمی یەكێك لە كووپەكان یەكسان دەبێت بە پلەی گەرمی ژوورەكە (٢٥ پلەی سیلیزی).

### دەرئەنجام بكە

ئایا گریمانەكەت راست بوو؟ باسی بكە

# دروستیمان

# لەکاتی خنکاندا . . .

ئەو بیرۆکانەی کە لەلاپەڕەکانی دیکەدا هاتوون پیشانمان دەدات چۆن دەتوانین فریاگوزاری سەرەتایی سادە پێشکەش بە خۆمان و ئەوانی دیکە بکەین. وە پێویستە هەردەم یەکێك لە گەورەکان ئاگادار بکەینەوە لەهەر ڕوودلوێك کە ڕوودەدات.

## ئەگەر یەکێك لە باری خنکاندندا دەبێت . . .







١. نیشانەی خنکاندنی گشتی جیابکەرەوە بە گرتنی مل بە هەردوو دەست، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە کەسێك لە خنکان دایە و پێویستی بە یارمەتی هەیە.

٢. هەردوو دەستەکانت لە دەوری کەمەری تووشبوو دابنێ بە مەرجێك لەپی دەستت لەسەر ناوکەکەی بێ و دەستی تر لەسەری دابنێ.

٣. هەردوو دەستەکانت بەلای خۆت رابکێشە و بە خێرایی و توند پەستانیان لەسەر بکە واتە لەسەر سکی ئەوەی کە لە خنکان دایە وە بۆ سەرەوە پێنج جار دووبارەی بکەوە.

## ئەگەر تۆ لە باری خنکان دایی و بەتەنیایی . . .



١. لەپی دەستێکت لەسەر ناوکەکەت دابنێ وە دەستی دیکەت لەسەری بێت. هەردوو دەستەکانت بە خێرایی و توند بۆ سەرەوە بکێشەوە.



٢. یان هەردوو دەستەکانت لەسەر سکت دابنێ، وە خۆت بچەمێنەوە لەسەر دەستی کورسێك یان لێواری مێزێك، وە بە لەپی دەست بۆ ناوەوە پەستان بکەوە و بۆ سەرەوە رابکێشە.

# لەکاتی خوێن بەربووندا . . .

## ئەگەر کەسێك خوێنی لێ بەربێ . . .




هەردوو دەستەکانت بە ئاو و سابوون بشۆرەوە.




دەستەوانەی خاوێن لەبەر بکە لە کاتی بوونیان.




برینە بچووکەکان بە ئاو و سابوون بشۆرەوە. برینی گەورە مەشۆ.




پارچە شاشییێکی خاوێن لەسەر برینەکە دابنێ. بۆ ماوەی ١٠ خولەك پەستان بخە سەری. شاشەکە لەم کاتە لا مەبە.




ئەگەر دەستەوانە نەبوو وابکە کە بریندارەکە خۆی پەستان بکاتە سەر شاشەکە بە دەستەکانی.




ئەگە خوێن بەربوونەکە دوابی ١٠ خولەك وەستا. برینەکە بپێچەوە. ئەگەر برینەکە خوێنی نەوەستا، بەردەوام بە لە پەستان و یارمەتی داوابکە.

## ئەگەر تۆ خوێنت لێ بەربێ . . .

- هەنگاوەکانی سەرەوە پەیڕەو بکە.
- یەکێکی گەورە ئاگادار بکە بە بریندارییەکەت.

## لەکاتی خوێن بەربوون لە لووتدا . . .



- دابنیشە و سەرت بەرەو پێشەوە دابنێ. پەستان بخە سەر هەردوو کونەلووتەکانت بە توندی بۆ ماوەی ١٠ خولەك.
- دەکرێ کیسێکی سەهۆڵ بخەیتە سەر لووتت.
- ئەگەر خوێن بەربوون بەردەوام بوو ئەوا یارمەتی یەکێکی گەورە داوا بکە.

## لەکاتی سووتان . . .

سووتانە سوکەکان بە سووتانی پلەیەک ناسراون. ئەویش تووشی چینەکانی سەرەوەی پێست دەبێت، تیایدا پێست سوور هەڵدەگەرێت و وشک دەبێ ئازای دەبێت، بەڵام سووتانی ترسناک پێی دەڵێن سووتانی پلە دوو، ئەم جۆرەیان چینەکانی سەرەوەو خوارەوەی پێست تووشی دەبن وە دەبێتە هۆی پەیدابوونی پۆرگ و سوورهەڵگەڕان و ئەستووربوون و ئێش و ئازار. سووتانی ترسناکی تر ئەوانەن کە لە پلە سێیەمن، تیایدا پێست خۆڵەمێشی دەبێ یان ڕەنگی سپی دەبێت، شێوەی سووتاو وەردەگرێت، بەڵام هەر جۆرێکی سووتان پێویستی بە فریاکەوتنی سەرەتایی و بەپەلە هەیە.

### سووتانە سادەکان

- شوێنە سووتاوەکە لە ژێر ئاوی سارد، بۆ ماوەی (٥)خولەک بەلای کەمەوە ڕابگرە.
- شوێنە سووتاوەکە بە شاشێکی خاوێن و وشک داپۆشە.
- هیچ مادە و مەرهەمێک لەسەر شوێنی سووتاو دانەنێیت.

### سووتانی ترسناك

- شوێنە سووتاوەکە بە شاشێکی تەڕ و سارد داپۆشە و هیچ پۆرگێک نەتەقێنیت.
- هیچ مادە و مەرهەمێک لەسەر شوێنی سووتاوەکە دانەنێیت.
- بەپەلە یارمەتی لە کەسێکی بەتەمەن داوابکە.

# لەکاتی پێوەدانی مێرووەکان . . .



▲ مێشوولە

- کەسێکی بە تەمەن لە پێوەدانەکە ئاگادار بکەوە.
- کە مێرووەکە پێوەیدایت، بە نینۆکەکانت لای بدە.
- شوێنی تووشبوو بە ئاو و سابوون بشۆرەوە.
- پارچە سەهۆڵێک بخە سەر شوێنی پێوەدانەکە چونکە لە ئێش و ئازار کەم دەکاتەوە. هەروەها هەویرێک کە لە بیکاربۆناتی سۆدیۆم و ئاو دروست کرابێت، لە ئێش و ئازار کەم دەکاتەوە.
- ئەگەر پێوەدانەکە ترسناک بوو، وە لەسەر باسکت یان لاقت بوو، پێویستە وا بکەیت کەباسکت یان لاقەکەت بۆ خوارەوە شۆربێتەوە پارچە قوماشێکی تەڕکراوە و سارد لەسەر شوێنی پێوەدانەکە دابنێ یارمەتی داوابکە بەپەلە.

## دژ بە میکرۆبەکان شەربکە

زانراوە ئەگەر بۆنی خۆراک ناخۆش بێت یان بۆگەن بووبێ، پێویستە فڕێبدرێت. لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی نەخۆشی، بەڵام هەر خۆراکێک کە بۆنی ناخۆشبێت مەرج نییە ببێتە هۆی نەخۆشی. بۆ ئەوەی خۆراک بە پارێزراوی و ساخلەمی بمێنێت و بۆ ئەوەی توشی نەخۆشیمان نەکات، پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین، کە لەم وێنەیەدا دیارە. ئاگاداربە ئەگەر گومانت لە خۆراکەکە هەبوو فڕێیبدە.



# چەند ڕێنماییەک دەربارەی دروستی خواردن



## دەربارەی ئامادەکردنی خواردن

- پێش ئامادەکردنی خورادن بە ئاوی شلەتێن و سابون دەستەکانت. وا باشترە ئەگەر دوایی ئامادەکردنی هەر خواردنێک دووبارە دەستەکانت بشۆریت.
- بە مەبەستی توانەوەی گۆشتی بەستوو، پێویستە بخرێتە ناو مایکرۆ یان ساردکەرەوە.
- دەفری ناکانزایی بەکاربهێنە بۆ دانانی خۆراک لەناو مایکرۆ.
- گۆشتی نەبرژاو و مریشک و ماسی و گۆشتاوەکانیان لە جۆرەکانی دیکەی خواردن دووربخەرەوە.
- پارچەکانی مەکینەی هاڕین و چەقۆوەکان و تەختەکان بەپەلە بشۆرە دوایی تەواوبوونی پارچەکردنی گۆشت یان ماسی یان مریشک.



## ڕێنماییەکانی لێنانی خواردن

- خواردنەکان بە باشی بکولێت، بەتایبەت گۆشت. لەبەرئەوەی لێنانی تەواو میکرۆبەکان لەناو دەبات.
- پێویستە گۆشتی سوور لە پلەی ٧١س° لێبنرێت. وە مریشک لە پلەی ٨٠ س° . ماسی فشەل دەبێ دوایی لێنانی.
- پێویستە ئەو خۆراکە نەخورێت کە هێلکەی نەبرژاوی یان زەردێنەی هێلکەی نەبرژاوی تێدابێت.



## چەند ڕێنماییەک دەربارەی خاوێن کردنەوەی چێشتخانە

## (شوێنی لێنانی خواردن)

- هەموو مەنجەڵ و تەختە و قاپەکان بە ئاو و سابون بشۆرەوە. ئەو سابوونە بەکاربهێنە کە میکرۆبەکان لەناو دەبات.
- ئەو خواردنەوەی دەمێنێتەوە لەناو مەنجەڵی بچووک بپارێزە و لەناو سارد کەرەوەی دابنێ. پاشماوەی خۆراک لەسەر مێزی نانخواردن مەهێڵە.

# پێناسەکان

## ئ

**ئاوی سوێر**: ئەو جۆرە ئاوەیە کە بڕێکی زۆر خوێی تواوەی تێدایە. (٥٦)

**ئاوی سازگار**: ئەو جۆرە ئاوەیە کە بڕێکی کەم خوێ تێدایە. (٥٦)

**ئامێری سادە**: ئەو ئامێرەیە کە یارمەتی خەڵك دەدات لە بەجێهێنانی ئیش (١٩٤).

**ئاوی ژێر زەوی**: ئاوی سازگارە لە ژێر زەویدا هەیە. (١٠٨)

**ئەستێرە**: گۆیەکی گەورەیە لە گازی گڕگرتوو. (١٢٨)

## ب

**بیابان**: ئەو ژینگەیە یەکە باران بارینی تێدا زۆر کەمە. (٤٢)

**باڵندە**: ئەوگیانەوەرانەن کە لەشیان بە پەڕ داپۆشراون دوو قاچ و دوو باڵیان هەیە. (٢٥)

**بەرهەمهێن**: ئەو جۆرە زیندەوەرەیە کە خۆراك بۆ خۆی بەرهەم دێنێت. (٦٩)

**بەهەڵم بوون**: کرداری گۆڕینی شلە بۆ گاز (١١٦)

**بارستایی**: بڕی ئەو ماددەیە یەکە لەهەر تەنێکدا هەیە. (١٥٢)

**بەکارهێن**: ئەو زیندەوەرەی خۆراك بۆ خۆی ناتوانی دروست بکات (٦٩)

## پ

**پوولەکە**: پەڕەی بچووکی ووردی تەنکی پانن لەشی ماسی داپۆشیوە. (٣٢)

**پەڕەکە**: ئەو بەشەیە لە لەشی ماسی کە یارمەتی جووڵەی ئەدات لە ئاودا. (٣٢)

**پلەی گەرمی**: پێوەرێکە بۆ گەرمی یان ساردی تەنێك (١٧٢)

**پواز**: دوو رووی بەیەکەوە نوساوی لارن (١٩٥)

## ت

**تۆو**: قۆناغی یەکەمە لەگەشەکردنی ئەو رووەکانەی کەرمگ و قەدو گەڵایان هەیە. (١٥)

**توێکڵی زەوی**: ئەوبەشەی زەوییە کە دەبینرێ. (٩٠)

**تاوێری نیشتەنی**: ئەو تاوێرانەن کە لە ئەنجامی کەلەکەبوونی ماددەکانی ترەوە بە شێوەیەکی چین چین پێك هاتوون وبە کاریگەری پەستان ئەو جیایانە پتەوبوون و بوونەتە تاوێر. (٩٤)

**تاوێری گۆڕاو**: تاوێری ئاگرین یان تاوێری نیشتنەوە یان تاوێری گۆڕاوی ترە کە بە کاریگەری گەرمی پەستان پێك دێن. (٩٤)

**تاوێری ئاگرین**: توانەتەوەو پاشان ساردبوونەوە وپتەوبووینە. (٩٤)

**تاوێرەکان**: تەنی رەقن لە خاوەکان پێکهاتوون. (٩٠)

**تێکەڵ**: بریتییە لە تێکەڵ کردنی دوو جۆرە ماددە یا زیاتر لەگەڵ یەکتری. (١٥٩)

ج

**جووڵە**: گۆڕانێکە لە شوێندا. (١٨٧)

چ

**چڕەبێ**: هەڵمی ئاو سارد دەبێ دەبێتە دلۆپ (١١٦)

خ

**خشۆك**: ئەو گیانەوەرانەن کە وشکانین و پێستێکی وشکی داپۆشراویان بە سیرمە هەیە. (٣٣)

**خاو**: تەنێکی رەقە لە سرووشتدا دروست بووە و نازیندەیە. (٨٨)

**خۆرگیران**: نەبینینی خۆر بەو هۆیەی کە سێبەری هەیڤ دەکەوێتە سەر زەوی. (١٣٦)

**خێرایی**: ئەو لادانەیە کە تەنێك لە کاتێکی دیاری کراودا دەیبڕێت. (١٨٨)

**خولگە**: ئەو ڕێڕەوەیە کە تەنێك لەسەری دەڕوات کاتێك بە دەوری تەنێکی تردا دەجووڵێت لە بۆشایی ئاسماندا. (١٢٦)

**خلۆکە**: ئامێرێکی سادە پێکهاتووە لە پەتێك یان زنجیرە کانزایی بە دەورەیدا دەسورێت. (١٩٦)

د

**دابارین**: ئەو ئاوەیە کە بەشێوەی باران یان تەزرە یان بەفرە،دەبارێتە سەر زەوی. (١١٧)

**دارستانی گەڵا وەریو**: دارستانێکە دارەکانی گەڵاکانیان پانن. (٥٠)

**دارستانی گەڵایی سەوز**: دارستانێکە گەڵای دارەکانی باریك و دەرزیلەیین. (٥٠).

ر

**ڕووان**: بریتییە لە دەرچوونی ڕووەکی ناو تۆو.(١٦)

**ڕیشووەکان**: ئەوبەشانەن لە لەشی گیانەوەرانی ئاوی، کە ئۆکسجینی تواوەی ناو ئاوی پێ وەردەگرێت. (٣١).

**ڕووەکە سادەکان**: ئەو ڕووەکانەن کە ڕەگ و قەدو گەڵایان نیە. (١٤)

**ڕووەك خۆر**: گیانەوەرن تەنها ڕووەك دەخۆن. (٦٩)

**ڕووی لار**: ڕووێکە کە بە گۆشەیەکی دیاریکراو لاردەبێتەوە لەسەر ڕوویەکی تری ئاسۆییدا. (١٩٥)

**ڕوەکانی هەیڤ**: شێوەی جیاواز بۆ هەیڤ لە ئاسماندا (١٣٤)

ز

**زنجیرەی خۆراك**: ڕێڕەوی جووڵەی خۆراکە لە زیندەوەرێکەوە بۆ زیندەوەرێکی تر. (٧٤)

ژ

**ژینگە**: هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوەکەبەدەوری زیندەوەر دایە لە شتی زیندەوو نازیندو. (٤٢)

**ژێرئاوکەوتن**: دەکەوێتە ژێر ئاو. (١٥٤)

س

**سووڕی تاوێر**: کردەی گۆڕینی جۆرە بەردێکە بە جۆرێکی تری بەرد. (٩٥)

**سیرمە**: ڕەقی تەنك یان ئەستورە لەش خشۆکەکان دادەپۆشێت. (٣٣)

**سووڕی ئاو**: بریتییە لە گواستنەوەی ئاو لە ڕووی زەوییەوە بۆ هەوا، پاشان سەرلەنوێ گەڕانەوەی بۆ ڕووی زەوی. (١١٦)

**سیستمی خۆر**: لە خۆر و لەو تەنانەی کە بەدەوریدا دەسووڕێتەوە و پێك دێت. (١٢٦)

**سەر ئاو کەوتن**: لەسەر ڕووی ئاو دەمێنێ. (١٥٤)

ش

**شیکەرەوە**: زیندەوەرێکە ماددە مردووەکان شی دەکاتەوە بۆ دەست کەوتنی خۆراك. (٧٠)

ك

**کرۆك**: ئەو چینەیە لە زەوی کە دەکەوێتە چەقەکەیەوە (٩٠)

**کارلێك کردن**: دوو شت یان زیندەوەر کارلێك دەکەن (٦٨)

**کێشکردن**: ئەو هێزە کە تەنەکان یەکتری پێ ڕادەکێشن لە ئەنجامی بارستاییەکەیانەوە. (١٨٩)

گ

**گەیێنەر**: ماددەیەکە کە پێیدا بە ئاسانی وزەی گەرمی دەگوێزرێتەوە. (١٧٧)

**گەرمی**: شتێکە کە وادەکات شتەکان گەرم ببن. (١٧٠)

**گەیاندن**: گوێزانەوەی وزەی گەرمییە لە تەنێکەوە بۆ تەنێکی نزیکە کە بەری دەکەوێت. (١٧٦)

**گەرمیپێو**: ئامێرێکە بۆ پێوانە کردنی ڕادەی گەرمی یان ساردی شتێك بەکار دەهێنرێت. (١٧٢)

**گۆشتخۆر**: ئەوگیانەوەرانەن کە گیانەوەرانی تر دەخۆن. (٧٠)

**گیراوە**: تێکەڵێکە هەندێ ماددەی جیاواز بە شێوەیەکی ڕێك تیایدا تێکەڵ دەبن (١٦٠)

ق

**قەبارە**: بڕی ئەو بۆشاییە یە کە ماددە داگیری دەکات. (١٥٣)

ل

**لێکخشاندن**: ئەو هێزەیە کە تەنەکانی جووڵاو ڕادەگرێت یان خێراییەکەیان کەم دەکاتەوە. (١٩٠)

م

**ماددە**: هەموو شتێك بۆشایێك داگیردەکات. (١٤٨)

**ماسی**: ئەو گیانەوەرانەن کە هەموو ژیانیان لە ئاودا بەسەر دەبەن و بەهۆی ڕیشوەکانیانەوە هەناسە دەدەن. (٣٢)

**مەمکدارەکان**: ئەوگیانەوەرانەن کە لەشیان بە فەروو یان موو داپۆشراون و بەچکەی خۆیان بەشیر بەخێو دەکەن. (٣٢)

**مێیەك**: بەمێ ئەندامی گوڵ دەووترێ کە دەکەوێتە چەقی بازنەی گوڵەوە. (١٨)

ن

**نێرەك**: بەشی نێرەی گوڵی ڕووەکە. (١٨)

**نەمام**: ڕووەکێکی بچووکە لە تۆ دەردەچێت لەکاتی ڕووانی. (١٦)

**نەگەیێنەر**: ئەو ماددانەن کە وزەی گەرمی ناتوانێت بە ئاسانی پێدا بگوازرێتەوە. (١٧٨)

**نویێڵ**: تولێکە دەخوولێتەوە بە دەوری خاڵێکی جێگیردا، کە پێی دەڵێن خاڵی ڕاگیربوون (١٩٤).

هـ

**هەرمی وزە**: وێنەیەکە بۆ دەرخستنی بڕی ئەو وزەی کە زیندەوەران بەکاری دەهێنن لە ژینگەکەیدا، ئەو بڕەش کەم دەبێتەوە تابەرەو سەرەوەی زنجیرەی خۆراك بڕۆین. (٧٦).

**هەمە چەشنە خۆر**: ئەو گیانەوەرانەن کە ڕووەك و گیانەوەران دەخۆن. (٧٠)

**هەسارە**: تەنێکی تاوێری یان گازی گەورەیە بە دەوری خۆردا دەسورێتەوە. (١٢٦)

**هەسارۆکە**: پارچەێکی تاوێرییە بە دەوری خۆردا دەسورێتەوە. (١٢٨)

**هەیڤ**: تەنێکی تاوێری گەورەیە لە دەوری هەسارەکەمان دەسوڕێت.(١٢٦)

**هەیڤ گیران**: نەبینینی هەیڤ، بەوهۆیەوە کە سێبەری زەوی دەکەوێتە سەر.(١٣٦)

**هێز**: بریتیە لە پاڵنان یان ڕاکێشان. (١٨٦)

**هێڵی بەفری بەردەوام**: ئەو بەرزییەی کە تیایدا بەفر لەسەرووی ئاستی خۆیی دەمێنێت بە درێژایی ساڵ. (٤٨)

و

**وشکاوەکییەکان**: ئەوگیانەوەرانەن کە سەرەتای ژیانیان لە ئاودا دەست پێ دەکەن پاشان دەچنە ووشکانیەوە لەوکاتەی کە پێ دەگەن. (٣٠)